# نەخۆشخانەکەی
# فەقێ حوسێن -ی مەنتک

نووسینی
**جەمال گردەسۆری**

ساڵی
٢٠١٧

ناوی کتێب : نەخۆشخانەکەی فەقێ حوسێن – ی مەنتك
نووسینی :جەمال گردەسۆری
تیراژ : (٥٠٠) دانە
شوێنی چاپ : چاپخانەی رۆژهەلآت/ هەولێر
دیزاین : کارژین خەلیل هیدایەت مام شێخ
بەرگ: خەلیل هیدایەت مام شێخ

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان /
هەرێمی کوردستان ژمارەی سپاردنی ( ٤٦٩) ی ساڵی ٢٠١٧ی پێدراوە

# وتەیەکی پێویست

لەسەرەتای سالآنی هەشتایەکان هەرزەکارێکی زۆر چالآکی چەند بوارێك بووم، یەکێك لەوانە بەدوای بواری کۆکردنەوەی بابەتی فۆلکلۆری بووم، رۆژێ لەرۆژان لەنێو مەجلیسێك گوێبیستی مەدحی زیرەکی فەقێ حوسێنی مەنتك بووم، کەدکتۆرێکی میللی زۆر بەناوباونگی دەشتی هەولێر بووە، چەندان نەخۆشی چارەسەر کردووەو هەرخۆشی دەرمانی درووست کردووە، بە تایبەت لە گیا بەهارییەکان، ئەو گوێبیستە هێندە کاریگەری لێ کردم، زۆر بەجددی کەوتمە دوای سۆراغی ژیانی فەقێ حوسێنی مەنتك، ئەوەبوو رۆژێك پێیان راگەیاندم خوارزایەکی هەیە کەناوی مام سۆفییە کاتی خۆی ماوەیەکی زۆر شاگردی فەقێ حوسێن بووەو ئێستا پاسەوانی دەواجنێکە لە ئاقاری گوندی هەمزەکۆر، بەڵێ لەیادمە مانگی رەمەزان بوو، بەزمانی بە رۆژی بەیانیەك بەهێڵی هەولێر، پردی چوومە ئاقاری گوندی هەمزەکۆرو لەوێ چوومە دەواجنەکەو بەمام سۆفی شاد بووم، دوای سلآو کەمێك دانیشتن مام سۆفی فەرمووی کوڕم تێنووت نییە، گوتم

نەخێر بەرۆژووم، گوتی تۆ کێی و خێرە هاتووی بۆ لام، گوتم بیستوومە تۆ خوارزای فەقێ حوسێنی مەنتکی و ماوەیەکی زۆر شارگردی فەقێ حوسێن بووی و شارەزاییەکی تەواوت لەسەر ژیان و دەرمانەکانی فەقێ حوسێن هەیەو منیش نووسەرم و دەمەوێ باسی ژیان و دەرمانەکانم بۆ بکەی و تاوەکو رۆژێ لەرۆژان بتوانم بەچاپی بگەیەنم، گوتی کوڕم زۆر خۆشحالم کە گەنجێکی وەك تۆ بەو تەمەنە بەرۆژووەو لەهەولێرەوەش هاتوویی و ماندوو بوونت کێشاوە بەسەرچاوان ئەوەی لەیادمە بۆت باس دەکەم، فەرموو قسە لەمن و نووسین لەتۆ، بە راستی بەو هەلس و کەوتەی مام سۆفی زۆر خۆشحاڵ بووم و ئەوەبوو چەند قەڵەم و دەفتەرێکم لەگەڵ خۆم بردبوو، گوتم فەرموو ئەو قسەی بۆ دەکردم و بەندەش دەینووسی تاوەکو نزیك مەغریب لەوێ بووم، بەڵێ زانیارییەکانی بۆ گێڕامەوەو کاتێ گوتی کوڕی تەواو ئینجا ئەگەر ئەم شەو میوانی مامی خۆت دەبی خۆشحاڵ دەبم ئەگەر نا ئەوە کاتی مەغریب نزیك بووەو بەرەو ماڵ بگەڕێوە باشەوت بەسەر دانێ چونکە ئۆتۆمبێك کەم دەبێت، بەندەش گوتی زۆر مەمنوونم و زۆر هیلاکم کردی، گوتی مەمنوونی خودای گەورە بە، ئینجا دەستم ماچ

کـرد و سـەرو رووخـەتی مـاچ کـردم و گـوتم ئینجـا بـەدوعا دەڕمەوە، گوتی یاخوا بەخێر بێی سەرچاوی مامت.

بەراســـتی زۆر بەخۆشـــحاڵیەوە گەڕامـــەوە ماڵـــەوەو دەستنووسـەکەم پـاك نـووس کـردن و بـەڵام بـەهۆی زروفـی نالەباری و بوومە فیراری سـەربازی نـەمتوانی بڵاوی بکەمـەوە تاوەکو دوای راپەڕینی بەهاری ساڵی ١٩٩١ لەگۆڤاری کاروان بڵاوم کردەوە، ئەوەی شایانی باس بێت مام سۆفی پیـاوێکی گەلێك رۆشنبیر بوو، خاوەن دەم و چاوێکی نوورانی و هێنـدە قسە خۆش لەدانیشتن لـەلای زۆر لـەزەتی هـەبوو، بەڵێ دوای چەند ساڵێك مام سۆفی کۆچی دوایی کـرد، ئینشـاڵڵا خـودای گـەورە لـە گوناهـەکانی بووریـیەو بـە بەهەشـتی خـۆی شـادی کردووە.

ئەم کتێبە بەم جۆرە هاتۆتـە بەرهـەم، کەبریتیـە لـەژیانی فـەقێ حوســێن و دەرمانخانەکـــەیی و ژمارەیـــەك لـــەو کەســـانەی چـــوونەتە لای و چارەســـەری کـــردوون و بەشـــێکیش لـــەو دەرمانانـــەی کـــە بـــەکاری هێنـــاون، بەنـــدە شـــارەزایی لـــە دەرمانـەکان نییـەو چـۆنی گوێبیسـت بـووەو ئـاوا تۆمـاری کردوون، بۆیە بەئامانەتەوە دەڵێم حەز ناکەم هیچ کەسێك ئەم دەرمانانە بەکار بهێنێت، پێویستە بۆ بەکار هێنـان بچێتە لای پسپۆڕانی ئەو بوارەو شوکر بۆ خوا لەم سـەردەمە ژمارەیـەکی

زۆری ئەو بوارە هەن و هەروەها ژمارەیەك لە بنەماڵەی فەقێ حوسێن شارەزاییان هەیەو سەرقاڵی دروست کردنی دەرمانی کـوردەوارین و بـەبێ بەرامبـەر بـەخێرات لـەرێگای خـوا بەنەخۆش دەبەخشن.

هەولێر ٢٤- ٧- ٢٠١٧

# نەخۆشخانەکەی فەقێ حوسێن–ی مەنتک

فەقێ حوسێنی مەنتك نەك بەتەنیا وەك ئەوانیتر پزیشکێکی کوردی بووەو بەس بەڵکو شوێنێکی تایبەتی بۆ ئیش کردنی دەرمانکردنی نەخۆشان تەرخان کردبوو،لە تەکیشیەوە شوێنێك تا رادەیەك لەنەخۆشخانە دەچوو ،بەهارو هاوین و پاییزیش نەخۆشخانەکەی بریتی بووە لە رەشماڵێکی حەوت ستوون،دووبەش بووە،بەشێك بۆ پیاوان،ئەوەکەی دیکەش بۆ ژنان، پەسارێك لەنێوان هەردوو بەشەکە هەبووە،بەچەشنی نەخۆشخانەش نەخۆشەکان لەوێ دەخەوتن،هەر نەخۆشێك بەپێی نەخۆشیەکەی خواردنی تایبەتی بۆ دەکراو پێخەف و نوێن و کەرەستەی خواردن و خواردنەوەشیان لەهی ماڵەکەی خۆیان جیابوو،دوو رەشماڵیش لەتەکیەوە هەڵ دەدا یەکێکیان بۆ دیوەخان و ئەوی دیکەیان بۆ ماڵەکەی،لەزستانیشدا خانووێکی بۆ نەخۆشخانە بووە،رۆژهەبووە بیست نەخۆشی پیاوو ژنی سەرەڕای خزم و کەسوکاری نەخۆشەکان لەماڵەکەیدا خەوتوون .

فـەقێ حوسـێن لەگەرمیانـەوە دەچـووە زۆزان،نەخۆشـخانە کۆچـەریەکەی دەپێچاو،چـوار پێـنج کەسـی بـۆ گواسـتنەوەی تەرخان دەکرد لەهات و چۆی کوێستان و گەرمیاندا بەکۆیـەو بیتـــوێن و زینــــی شــــێرۆکان و قەسروماکۆســــان–دا تێدەپەڕی،لەهەر شوێنێك نەخۆش هەبووایە،بارگەو بارخانەی لێ دادەکوتــاو دەســـتی بـــەدەرمان کردنـــی نەخۆشـــەکان دەکرد،جـاری وا هـەبووە دەبـوو چـەند رۆژێـك لەیـەك جێگـا بمێنێتـەوە بـۆ بەسـەر کردنـەوەی تەندروسـتی نەخۆشـان زۆر وەخـت لەهـەورازی جۆنـەر لەهـەورازی رایـات لـە نزێك حـاجی ئۆمەراندا دەمایەوە ئیتر تـا دەگەیشـتە بن چیای هـەڵگورد لـە ئاقـاری دێـی گونـدە زوودەوە لەسـەر کانیـەکی بـەردەڕەش رەشمـاڵی لێ هەڵدەدا،زۆرجار لەکـەژی هاوینانـدا بـۆ ئـەودیوی کوردسـتانی ئێـران دەپەڕیـەوەو کوردەکـانی ئـەوێی دەرمـان دەکرد،زۆر پیاوێکی چاك بوو بەزەیی بە نەخۆشان دەهاتەوەو پارەیـەکی زۆرکـەمی لێ وەردەگرتن،پـارەی لـە مـەلاو فـەقێ و شێخ و سەید و هۆزی مـەنتك وەرنەدەگرت،خـەڵك زۆر روویـان تــێ دەکرد،چــونکە ناوبــانگی بــڵاو بووبووەوە،جارێــك شکایەتیان لە فەقێ کرد،دەزگای میری لەدووای نارد کە بچێ بـۆ کۆیە،بـەڵام ئـەو رووی لـە هـەولێر کـردوو چـووە لای مـەلا

فەندی کە پیاوێکی دەسەڵاتدار بوو،مەلا ئەفەندی گوتی: بڕۆ حەکیمیی خۆت بکەو نایەلم بگیرێی .

فــەقێ حوســێن پزیشــکێکی میللــی گــەورەو بــەناوبانگ و شارەزای کورد بووە، دووریش نییە گەورەترین و شارەزاترین پزیشــکی میللــی چــەرخی بیســتــەم بــێ لــە کوردســتاندا خزمەتێکی بێ رادەی گەلی کوردی کردووە،بەتایبەتی، چونکە خـاوەنی نەخۆشـخانەیەکی گـوێزەرەوە بـووەو لەکۆچـەریدا هەڵکـەوتووە وە لەبـەر ئـەوەی رەوەنـدی دەکـرد بـەردەوام گـەرمیان و کوێسـتانی بەسـەر دەکـردەوەو سـوارە شـۆڕی کۆچەری دەشتی هەولێر تا هەوارگەکانی ناوچەی رەواندوزو نزیکـی شـنۆیێ لەکوردسـتانی ئێرانـدا چووە ،ناوبـانگی زۆر بڵاو بووەو خەڵکی ئەم ناوچانە سوودێکی یـەکجار زۆریـان لێ بینیوە .

فەقێ لەباوکیـەوە مام تـەها کە پزیشـکێکی شـارەزا بـووەو لـە باوکییــەوە دەروێــش عــەلی واتــە بــاپیری فــەقێ شــارەزایی لــەجۆرەها نەخۆشــی پەیــدا کردووە،بەتایبــەتی نەخۆشــی چاو،برینسـازی پێـوەدانی مـارو شکەسـتە دەرمانەکانیشــی بـەزۆری لـەم جـۆرە گیایانـە دروسـت دەگرتـەوە کـە لـەکاتی هاتووچـۆکردنیدا بـۆ گـەرمیان کوێسـتان کـۆی دەکـردەوە وەداوودەرمـان و دەرمانخانەکەشـی بـەکار دەهێنا،بـەڵێ فـەقێ

پزیشکێکی لەبارو ناسراو بووە،تەماشا کردنێکی سەرپێیی بۆ نەخۆش بەس بووە،کە بزانێ نەخۆشییەکەی چییە،هەروەکو دەگێڕنەوە دەڵێن: ئەگەر تەماشای دەمی نەخۆشی بکردبایەو لێدانی دڵی بگرتبایە یەکسەر دەیزانی نەخۆشییەکەی چییەو جا ئەگەر نەخۆشییەکەی تاکە بایەو تیمارو دەرمان کردنی سوود بەخش نەبووایە،ئەوە یەکسەر پێی دەگوت بچۆ دەرمانت لام دەست ناکەوێ ،دەڕۆییەوە .

فەقێ لەبرینسازیدا برینی خەنجەرو گوللە شارەزاو دەست سووك بووە، وەزۆرجاریش دەستی لەهەندێ جۆر نەخۆشی دەدا دکتۆرەکان نەیانتوانیوە چارەسەری بکەن .

فەقێ حوسێن مرۆڤێکی هەڵکەوتوو،زاناو ئاقڵمەند بوو،قسەخۆش و سەخی بووە،بەرەحم و دڵ نەرم بوو،حەزی لەهەژارو دەست کورتان دەکردو یارمەتییانی دەدا،پیاوێکی ئایین پەروەرو دیننناس بووە،پیاوێکی لاوچاکی سوورو سپی و موو زەردو سمێڵ گەورەو ریش کورت بووە،کورتەك و شەرواڵی لەبەر دەکردو تفەنگ و دەمانچەو خەنجەری دایم پێ بووە .

فەقێ حوسێن دەوڵەمەندو گەورەی تیرەی ئادی بووە لەعەشیرەتی مەنتك کە لقێکە لەسوورچی و سۆران،زۆر سەخی و هەردەم خاوەن دیوەخان بوو،کە بەلای کەمەوە

ڕۆژێ چل پەنجا کەسێك لەدیوەخانەکەی ئەو نانی دەخوارد ،بەڕێزو گران بوو لای خەڵك خۆشەویست بوو،مام حاجی سۆفی خوارزای فەقێ حوسێن بوو بۆی گێڕامەوەو وتی: فەقێ حوسێن زۆر ئایین پەروەربوو ،چووە بۆ حەج،چوار براو دوو خوشکی هەبوو،برایەکان ناویان مام شێخ و فەقێ حوسێن و حەسەن و نەجم بوو،خوشکەکانی ناویان خەجیج و فاتمە بوو،بەڵام بەداخەوە هیچیان لەژیاندا نەماون،خودا لێیان خۆش بێت، گشت برایەکانی فەقێ شارەزاییان هەبوو،بەڵام فەقێ لەهەموویان شارەزایی زیاتر هەبوو،لە باوکیشی فێرببوو،فەقێ حوسێن قورئانی ختم کردبوو،بۆیە پێیان دەگوت فەقێ،هەر گەرمیان و کوێستانی دەکرد،چونکە خاوەن مەڕومالأت بوو،لە ٦٥ ساڵی کۆچی دوایی کردو گۆڕەکەی لای عەشیرەتی باڵەکایەتی لە گوندی خۆشکا،ئەو گوندە سەر بە گەلاڵەیە، گەلاڵەش سەر بەقەزای ڕەواندوزە،کابرایەکی زۆر ئایین پەرست بوو،نوێژی واجبی دەکردو نوێژانی سوننەتی دەکردو سوننەتی وەتری دەکردو سوننەتی سەلات و تەسبیحی دەردو سەلات حەلەڵلای دەکردو سەلأت و لەیلیشی دەکرد بەبەردەوام بەدەست نوێژ بوو،زۆر نان دەربوو،بەبەردەوام قسەخۆش بوو ڕەنگی زەرد بوو،نەکورت و نەدرێژ بوو،هەرچەند بڵێی مرۆڤێکی جوان

بوو،موو زەرد بوو،دوو ژنی هێنابوو،ناویان ئایش و زولەیخا بوو،لەئایش ژنی گەورەی ٦ منداڵی هەبوو،٣ کوڕو ٣ کچ،کوڕەکان ئەحمەد و عەبدوڵرەحمان و فەقێ،کچەکان هەیبەت و عائشەو بەسێ بوو، لە زولەیخا ٢ کیژی هەبوو،ناویان کافیەو سافیە بوو،هەروەها گوتی: میریی ئەوکات زۆر هەوڵی دەداو پێی دەگوت: وەرە بڕوانامەت بدەمێ، فەقێ دەیگوت: بڕوانامەم ناوێ،فەقێ حوسێن لەناوچەی کۆیێ کۆچەری بوو،سێ مانگ دەچووە بەلەباوێ،سێ مانگی هاوین دەچووە کوێستانێ هەم ناوچەی دەوڵەتی ئێران،دەچووە قەندیل و هەڵگورد چیغی دەری ڕێز! هەم کێلەشین بوو،سێ مانگی زستان لەقەزای کۆیێ لەگوندی ئاخوڕە،یان ڕەسولێ بسکۆڵێ یەك لەم گوندانە جێگیر دەبوون .
هەروەها لەساڵی ١٩٣٤ فەقێ دیوەخانێکی گەورەی دروست کرد لەئاخوڕە .

# بەشێک لەو کەسانەی چوونەتە لای فەقێ حوسێن

١- خـــــدری ئەحمــــەدی پاشـــــای دزەیــــی: دەنگـــــی نووسابوو،ئەوەندەی هاتووچۆی لای دکتۆرانی کرد بێ سوود بوو،ئینجـا چـووە لای فـەقێ حوسـێن،ئەویش خـوێنی لـەبن زمانی بەردا بەزوویی چابۆوە .

٢- مـام سـۆفی خـوارزای فـەقێ حوسـێن وتـی: جارێکیـان دکتۆرێك بۆ بینینی شارەزایی بۆ لای نێردرا،دکتۆرەکە چەند پرسیارێکی پزیشکی لێکرد بۆ ئەوەی بزانێ رادەی شارەزایی لــەم بارەیــەوە چــەندە،لێی پرســی: خــوێن کــە بــەردەبێ و دەکەوێتە رێ،چۆن رادەوستێتەوە ؟ هەروەها پێـی وت: سـودا لـە چییەوە پەیـدا دەبـێ ؟ فـەقێ حوسـێنیش بەشـارەزایی و باشی وەڵامی دایـەوە، ئینجا دکتۆرەکە زانـی کـەوا مرۆڤێکـی شـــارەزایە داوای لێکـــرد کـــە لەگـــەڵی ئـــیش بکـــات،رازی نەبوو،گوتی: من ناتوانم واز لەرەوەندایەتی و کۆچەری و هات و چـــۆی گـــەرمیان و کوێســـتان بهێنم،وەنـــاتوانم لەتاکـــە شـوێنێکدا جـێگیر بم، دکتۆرەکـە زۆری هـەوڵ لەگەڵدا،بـەڵام فەقێ لەگەڵی نەچوو .

٣-مام سۆفی خوارزای فەقێ حوسێن وتی: وەرزی پایز بوو،ماریان لە سنووری ئێران هاتە خوارێ،کابرایەکی خەیلانیان بەغەڵەتی تفەنگی لەدەست دەرچوو بەفەقێ حوسێن کەوت،لەپشتی لەسکی هاتەدەرێ،ئەم گوللەیە ریخەڵۆکەکی بڕی بوو،فەقێ بابی مابوو ،پێی گوت بەحاجی شێخی کە ئامۆزای بوو،ئەم ریخەلۆکە بدوورەوە،ئەویش وتی: چۆن بیدوورمەوە،وتی: هەردوو سەری بگەینە یەکتری مێرووستانێ بهێنە لای پاشووی بگرەو ئەزیەتی بدە لای پێشەوەی لەسەر ریخەلۆکەکە دابنێ هەتا گەزەی لێبدا ئەوەی زیادە بیبڕێ واتا سەرەکەی،ئەویش ئاوای کردو بەم جۆرە نەشتەرگەری کرد،چاکبۆوە،٢٥ ساڵ پاش ئەوکات میزی گیراو بردیانە نەخۆشخانەی کەرکووك نواندیان نەشتەرگەریان کردوو لە نەشتەرگەری دەرچوو،پاشان لە فەقێ یان پرسی نەشتەرگەریەکەت چۆن بوو ؟ گوتی ئەم کەلوپەلەم هەبوایە لەویم باشتر نەشتەرگەریم دەکرد، ٢٠ ساڵ پاش هەینێ زستان بوو،ماڵیان لە بانەقەڵاتی لەقەزای کۆیسنجاق بوو نەخۆشی گەرووی گرت،برایێکی هەبوو ناوی مام شێخ،فەقێ پێی گوت: ئەمن لەم نەخۆشییەی خۆم زۆر دەترسێم،وەرە بۆم تەماشا بکە،مام شێخ تەماشای کردو گوتی: گەرووت هیچ بەلای لێ نییە،گوتی: وەرە خوێنم لەبن زمان بەردە،خوێنی

لەبن زمانی بەرداو ئەو نەخۆشییەی چاك نەبوو، چوو بۆ بەغدایێ،لەبەغدایێ پێیان گوت: ئەم نەخۆشییە بەئێمە چاك نابێ،فەقێ حوسێنەك هەیە لەدەشتی کۆیە ئەو لەم نەخۆشییانە باش دەزانێ برۆ بۆلای ئەو،هەزاران نەخۆشی ئاوای چاك کردۆتەوە .

فەقی گوتی: ئەو دکتۆرەی باسی دەکەن منم .

فەقێ حوسێن چاری نەکرا گەڕایەوە،ئەم نەخۆشییە حەوت مانگی خایاند، بنەگەو ماڵیان لەقەندیل بوو،ئەویش لەبەر نەخۆشییەکەی هاتبوون بۆ ئەوێ،ماڵی کوڕی لەوێ بوو کەناوی ئەحمەد بوو،فەقێ حوسێن لەوێ لە تەمەنی ٦٥ساڵیدا کۆچی دوایی کرد،لەگۆڕستانی خوشکە شاردیانەوە لەناوچەی گەراری،خودا لێی خۆشبێت .

٤- کاتێ فەقێ حوسێن لە نەخۆشخانەی کەرکووك بوو،کابرایەکیان هێنایە نەخۆشخانەی نواندیان نیاز وابوو سبەی نەشتەرگەری بۆ بکەن،فەقی گوتی: نەشتەرگەری خۆت مەکە ئەتوو لەشیوی جەژن وات لێ هاتووە،برۆ بۆ ناو بەستێك زەرەندی بێنە بیکە بە حەب چاك دەبی،بۆ بەیانی دکتۆرەکان گوتیان: بێنە نەشتەرگەریت بۆ بکەین،کابرا گوتی: نەشتەرگەری خۆم ناکەم،گوتیان: بۆ ؟ کابرا گوتی: ئەم

کابرایــە گــوتی: ئــەم گیایــەی بخــۆی چــاك دەبــی،منیش نەشتەرگەری خۆم ناکەم .

٥– لەموســڵ: لەشــاری موســڵ زابتــەك هاتــە لای،بەبــەرگی مەدەنی،فەقێ پێی گوت: تۆ موەزەفی بۆچی هاتووی بۆ ئێرە؟ زابتەکە گوتی: من نەخۆشم،لە شاری موسڵ هاتوومەتە لات دەرمــانی پێــداو بــەماوەی ١٥ رۆژ نەخۆشــییەکەی چــاك بۆوە،نەخۆشیی سوکەری بوو،کاتێ نەخۆشییەکەی چاك بۆوە گوتی: من زابتم لەموسڵەوە هاتوومە،فەقێ پێی گوت: چۆنت زانـی هـاتی بۆلام ؟ زابتەکە گـوتی: جـووەك بـەمنی گوت،مـام حوســێن تــەها نــەخۆش بــوو لــەلای فــەقێ حوســێن چــاك بۆتەوە،تۆش برۆ بۆ لای،ئەو رێگای نیشان دام .

٦– حوســێنی مــەلای کاربەدەســت بــوو رەئیســی دزەییــان بوو،کورێکی هەبوو ناوی نـوری بوو،لەبەغدایێ ئۆتـۆمبێلی لێ وەرگەڕا قۆڵی شکا،دووجاریان بردە لەندەن چاك نەبۆوە،ماڵی فـەقێ لەدەشـتی هەرەجـەی بـوو لـە گـۆری خالـدار ئـەم نـوری یەیان بردە لای،فـەقێ دەرمـانی کرد،نوری گـوتی: ئـەم قۆڵـەی من ئێسکی نییە،ئەمن چوویمە لەندەن،فـەقێ حوسـێن گـوتی: سبەی نا دووسبەی بۆت روون دەبێتـەوە قۆڵـت ئێسـکی هەیـە یـان نییە،بـەیانی نەشـتەرگەری کرد،دوانـزدە ئێسـکی زیـادی

لەقۆڵی دەرهێنا،لەپاش هەفتەیەك نوری چاك بۆوەو گەڕاوە بەرەو گوندی قازیخانە .

٧-ماڵیان لەئاقاری هەرەجەی بوو،کابراییێکیان هێنا لای خەڵکی دەرگەڵەی بوو لە ناوچەی رەواندوز لەماینی کەوتبووە خوارەوە،پێشی سەری شکابوو،لەپشتی سەری نەشتەرگەری کرد ئێسکێکی زیادەی دەرهێنا بۆ ماوەی ٦ مانگ چاك بۆوە .

میر حەمەدی لەگەڵدا بوو،لەپێش فەقێ گوتی: ئەگەر ئەم هێسکەی دەرنەهێنم دەمری،هەموو ساڵ برینەکە دەگەڕێتەوەو قەپات نابێ،میر حەمەد گوتی: نەشتەرگەری بکە عایدی خۆم،نەشتەرگەری کرد دەرچوو چاك بۆوە .

٨- پایز بوو ماڵیان لە بالیسانێ کابراییێکیان هێنا لای لەشی ئەستوور ببوو،خەڵکی دەراشێ بوو،ئەوەی لەگەڵی هاتبوو برای بوو زۆر هەوڵی لەگەڵداو دەرمانی پێدا،زانی چارەی ناکرێ،بەدزی بەبراکەی گوت: ئەم نەخۆشەی ببەوە،براکەی گوتی: بۆ ؟ فەقێ گوتی: چارەی ناکرێ و دەمرێ واباشە لەماڵی خۆی بمرێ،کابرا نەخۆشەکەی بردەوە ماڵێ و شەو کابرا کۆچی دوایی کرد .

٩- ماڵیان لە عەلیاوەی کۆیێ بوو،نەخۆشەکیان هێنا لای لەشی دەخورا، نەخۆش خەڵکی کۆیێ بوو،فەقێ زەرەندی بۆ

کـرد بـە حـەب و لەگـەڵ چـەند دەرمـانێکی دیکـە دایـە نەخۆشـەکەو پێـی وت: گۆشـتی رەشـاتی مەخۆ،نـەخۆش بـۆ ماوەی ١٢ رۆژ چاك بۆوە .

١٠- شێخ مارفەك هەبوو خەڵکی هەڵەبجەی،نەخۆشیەکی لە کـەپووی هـاتبوو چـووە بەغـدایێ لەبەغـدا پێیـان وتبـوو: کـەپووت دەبـڕین و کـەپووێکی لاسـتیکی بـۆ دروسـت دەکەین،شـێخ مـارف قبـوڵ ناکا،دەگەڕێتـەوە بـۆ هەڵەبجە،لەهەڵەبجە برادەرێکی دەبێ لەگەڵ برادەرەکەی دێتە لای فـەقێ حوسـێن،ئەویش تـەداوی دەکـاو چـەند جـۆرە دەرمانێکی تێکەڵ دەکاو لەکەپووی دەنێ بۆ ماوەی هەفتەیەك کەپووی چاك دەبێتەوە .

١١- رۆژێ فەقێ حوسێن لەسەفەرێك دەهاتەوە،بانگیان کرد وتیـان: راوەستە هاتینـە لای تـۆ پیاوەکمـان هێنـاوە کولـك-ی لـەبن گـوێی هـاتووە، فـەقێ دەڵـێ: ئەمشـەو گلێخـەی لێ بنـێن ئەگەر بەیانی دەربوو باشە،ئەگەر دەرنەبوو وەرنە لای من ماڵم لـە بانەقـەڵاتێ-یە،بـەیانی دەیبـەن بـۆ لای و کولکەکـەی نەشـتەرگەری دەکا،دەرچـوو ئینجـا پێـی وت: بـڕۆن شـۆربا برنجـی لێ بنـێن ئەمـە برسـییەتی،کابرا وتـی: چـۆنت زانـی برسیمە ؟

١٢–ماڵیان لەکوێستان بوو لەبن هەڵگوردی کابرایەکیان هێنا لای زەرتکـــی بوو،هـــەنارو هەنـــدێك ماســـی بەزینـــدوویی ماسـییەکانی لـەناو ئـاویٚ کـردن لـە پێشـی دانا،کـابرا وتـی: پشـتم شـکا،وتی: راسـت نەبییـەوە قوڕیشـی لەپشـتی ملـی کرد،بۆ ئەوەی نەڕژیٚ،وتیان: بۆ وای لیٚ دەکەی ؟ وتی: کەسی خاڵی نیشانەی ئەوەی ماسییەکان بمرن نەخۆشییەکەی چاك دەبێتەوە،هەنـدێك گیـای دەرمـانی دایـیٚ و ماسـییەکانیش مردن،کابرا چاك بۆوە .

١٣– ئاغایەکی هرکی هـەبوو،ماڵیان لەکێلەشین،ئاغای هرکـی کوڕێکی هەبوو،تووشی نەخۆشی خروش ببوو،لـەدوای فـەقیٚ حوسـێنی نارد،فـەقیٚ چـوو،کاتیٚ چـوو دەبینـیٚ دکتـۆرێکی هـــەولێری لەلایە،ســـیٚ مـــانگ لـــە لای بـــووە، پێـــی چـــاك نەبۆتـەوە،وتی: بەفـەقیٚ: کوڕەکـەم بەچـەند رۆژان بـۆ چـاك دەکەیتـەوە ؟ فـەقیٚ وتـی: بـەدوازدە رۆژان کوڕەکـەت بـۆ چـاك دەکەمەوە .

دکتۆرەکـە گەڕایـەوە بـۆ هەولێر،فـەقیٚ حوسـێن تەیرۆکـەکی دەگـری، تەیرۆکەکـە لەسـەر پشـتی خـەتێکی سوٚرو خـەتێکی رەشـیی هەیـە بـەهاران دەبیٚ،تەیرۆکەکـە لەگـەڵ رۆنـی چێڵـی زەرد لێکی دەداو لەلەشی دەسویٚ ماوەی دوازدە رۆژیشی پیٚ ناچیٚ چاك دەبێتەوە .

١٤- ساڵەکی،لەلای سارتکێ پیاوەکی هاتە لای نەخۆشی سەرەتانی هەبوو ،لەوەرزی زستان بوو،پێی وت: ئێستا بگەڕێوە بەهاری وەرە لام،ئێستا دەرمان ناکرێی،بەهارێ هاتەوە لەگەڵ خۆی بردیە کوێستان،ناوی سوارە بوو،خەڵکی گوندی قەرەسالم بوو بەماوەی سێ مانگ چاك بوو( تا ئەم دیمانەیەی لەگەڵ مام سۆفی لەژیاندا مابوو) ماڵی فەقێ حوسێن لە قەرەبۆتان بوو،ئێسکی کابرای رنی دەرمانی سلێمانی جۆرە دەرمانێکە دەرمانی کرد .

١٥- جارێکیان ماڵیان لەکوێستان بوو،لە فەدەنگ لەسەکران،کابرایەکی هاتەلای گەرووی بریندار ببوو،فەقێ ١٦ دەرمانی بۆ تێکەڵ کرد،یەکیان رەشی کەرەکی،هەردێنەی زەرد جۆرە گیایەکن،خواردنی سوێری لێ قەدەغە کرد،وەکی پایزی شکاند سەرو پێچکی رەشانی دایێ،کابرا چارەسەری بوو لەنەخۆشییەکەی .

١٦- ساڵێکی ماڵیان لەئێران بوو،پیرەژنێك هاتە لای برینداریيەکی هەبوو،پیرەژن ژنە ئاغا بوو،فەقێ دەرمانی بۆ گرتەوەو خستییە سەر برینەکە،پیرەژن وتی: ئەم دەربکەن ئاگری پێیە،دووایی بۆ ماوەی ٧-٨ رۆژ چاك بۆوەو،دوایی چەند جارێك هاتەوە لای فەقێ وتی: دەبێ لێم ببووری وتم: فەقێ دەربکەن،نەمزانی دەرمانی تۆ هێندە چاکە .

١٧- ساڵێكماڵیان لە قربەتاخی بوو،وەرزی زستان بوو،نەخۆشەکیان هێنایە لای فەقێ بەدزی بەکابرای وت: نەخۆشەکەی ببەوە دەمرێ،واباشە لەناو ماڵ و منداڵی خۆی بمرێ،کابرا نەخۆشەکەی بردەوە لەڕێ کۆچی دوایی کرد .

١٨- جارێك قەوم بەشەڕ دێن،حاجی رەسوڵ دەچێتە بەینیان لێکیان بکاتەوە،هەردووك عەشیرەتی باڵەکی بوون،رەسوڵیش باڵەکی بوو، گوللەکی بەسەری دەکەوێ،فەقێ حوسێن چوو دەرمانی بکات،خوارزای فەقێ حوسێن ناوی حەلیم بوو،بەخاڵی فەقێ وت: خاڵە حاجی رەسوڵ برینداریيەکەی چۆنە ؟ فەقێ وتی: گەرچی ئێستا باش دیارەو نانی دەخواو قسە دەکات بۆ ماوەی دوو رۆژیتر دەمرێت،پەردەی سەری زەرەری هێناوە،دوو سێ رۆژی پێدەچێ حاجی رەسوڵ کۆچی دوو ایی دەکات .

١٩- ساڵێکی پایز بوو،ماڵیان لە بەنەباوی لای کۆیە دەبێ،کابراییێکیان هێنا لای دەمانچەیەکیان لەپێی دابوو،ساڵی پێشتر برینەکەی تەداوی کرابوو،فەقێ وتی: پێیەکەت گوللەی تێدایە،کابرا وتی: ساڵێکە لەلای دکتۆرم لە کەرکووك،برینی من گوللەی تێدا نییە،فەقێ وتی: راوەستە بۆت بەدیار دەکەوێ،بەیانی پێی تەداوی کرد،گوللەیەکی بەساغی لە برینەکەی دەرهێناو پێی نیشاندا،کابرا وتی:

راستت کرد،برینەکەی بەجۆرە دەرمانێك تەداوی کرد،پێیان دەوت: دەرمانی زەردە لەگەڵ چەند جۆرە دەرمانێکی دیکە تێکەڵی کرد،دەرمانی زەرد لەشاری دەکرا،بۆ ماوەی چەند رۆژێك برینەکەی چاك بوو .

٢٠- جارێك ماڵیان لە قاربەتان بوو،کابراییێکیان هێنا لای،کابرا نەخۆش بوو،هەروەها هەرایش بوو،فەقێ دەرمانی پێداو چارەسەری کردو پارەشی پێدا لەبەر ئەوەی هەژاربوو .

٢١- جارێك ماڵیان لە بانەقەلاتێ بوو، میزی نەدەستاند،سەرۆك مالیەی کۆیێ نەخۆش بوو،سکی دێشا،مەعیدەی دێشا،فەقێ دەرمانی پێداو چارەسەری کرد،نەخۆشییەکەی چاك بۆوە .

٢٢- جارێك کابراییێك هاتە لای،گوتییە کابرای چیتە ؟ کابرا وتی: فەقێ ئاوم لەدەمی دێ کاتێ دەخەوم،فەقێ رێواس و برنجی بێ خوێی پێداو کرمی دانا،بەم دەرمانە چاك بۆوە،لەنەخۆشییەکەی .

٢٣- رۆژێك فەقێ حوسێن دەبێتە میوانی ماڵێك،نان و ماستی بۆ دەهێنن، نان و ماستەکەی دەخواو دوورایی لەخاوەن ماڵەکە دەپرسێ و دەڵێ: هەموو رۆژ نان و ماست دەخۆن ؟ دەڵێن: بەڵێ .فەقێ دەڵێ: خراپە جەرگی رەق دەکا .

٢٤- هاوڕێیەکەم ناوی صادق بۆی گێڕامەوەو وتی: ساڵێك ردێنم چەند شوێنێکی لووس ببوو،موی لێ نەدەهات،چەند دکتۆرم کرد،چارەی نەبوو، هەتا چوومە لای کوڕی فەقێ حوسێن،ئەویش وتی: زۆر ئاسانە هەرکاتێ تراشیت لەپاشان بەخوێ بیشۆ،منیش وام کرد چاکبوومەوە .

# دەرمانەکان

ئـەم چـەندان جـۆرە دەرمانـەی لێـرەدا باسـم کـردوون بەشـی هەرەزۆری دەرمانی ئەو زاتەیە،بەڵام بەدووری نازانم دەرمانی دیکـەی کوردەواری تیـادا هـەبێت ،چونکە لەسـەر زاری ئـەم و ئەو وەرگیراون،لەرووی سوود گەیاندن خۆم تاقیم نەکردۆتەوە یـــاخود بەچـــاوی خـــۆم بینیبم،ئەمانـــە دەرمـــانی کوردەوارین،بێگومان جاران لـەکوردەواری وەك ئێـستا هێنـدە دکتـۆر نـەبووەو بەشـی زۆری نێـو کـوردەواری کەلەگونـدەکان دەژیـان هێنـدە روویـان لـەدکتۆر نـەدەکرد بێگومـان دکتـۆری میللـیش هـەبووەو شـارەزایەکی تـەواوی هـەبووە بەنموونـەی فـەقێ حوسـێنی مـەنتك کەشـایەدحاڵ زۆرن و زۆربـەی خۆیـان چوونەتە لای و نەخۆشیەکانیان لـەلای ئـەو چارە کراوە،ئـەم دەرمانانەش بەشێکن لەدەرمانی کوردەواری و بـەهێوای ئـەوە ئەم کارەم کردووە سوود بگەیەنێت،ئەم روون کردنەوەیشم بۆ ئەوەیـــە ئێـــوەی خوێنـــەر لەبۆچـــوونەکەم بگەن،ئەمـــەش بەمەبەستی ئەمانەتەو بەس .

١– سووتان:

ئەگەر یەکێك مووی لەچاو بهاتایە جێگای مووەکەیان دەسووتاند بێ ئەوەی برژانگی بسووتێ و ئیتر جارێکیتر موو لەچاوی نەدەهات .

٢– پەردەهەور:

یەکێك ئەم پەردە هەور–ی لەسەر چاو بووایە چەند جارێك دەرمانی دەکرد پەردەکە نەدەما .

٣– رۆن و ماست:

ئەم دەرمانە بەکاردێ بۆ نەخۆشی (تا) بەتایبەتی بۆ منداڵان.

ئامادەکردن و بەکارهێنانی:

رۆن و ماستەکە تێکەڵ دەکەن و ئاگرێکی هەڵ دەکەن و منداڵەکەی لەنزیك ئاگرەکەی دادەنێن،ئینجا لەشی بەرۆن و ماستەکە چەور دەکەن،چەند جارێك،ئیدی تایەکەی نامێنێ .

٤– پەلکەتوو:

ئەم دەرمانە بەکاردێ بۆ قونێر .

ئامادەکردن و بەکارهێنانی:

پەلکە توویەکی دەهێنن و جوان دەیشۆن،ئینجا پەلکە تووەکەی لەسەر قونێرەکەی دادەنێن و بەپارچە قوماشێك دەیبەستن،چەند جارێك بەمجۆرە،قونێرەکە دەردەبێ و چاك دەبێتەوە .

٥- رۆن:

ئەم دەرمانە بەکار دەهێنن بۆ نەخۆشی دەست و پێ قەرەشی.

ئامادەکردن و بەکارهێنانی:

رۆن لەشوێنە قەرەشتییەکە دەدەن بەتایبەتی کاتی ئێواران ئینجا بەیانی جوان دەیشۆن بەماوەی چەند رۆژێك ئینجا چاك دەبێ .

٦- دڕکە زەردە:

ئەم گیایە دەرمانە بەکاردێ بۆ نەخۆشی قەرەشتی .

ئامادەکردن و بەکارهێنانی:

چەندان دڕکە زەردەی دەهێنن و وردی دەکەن،دەیخەنە ناو قاپێك،لە دووایی سەر ئاگرو تۆزێك ئاوی تێدەکەن هەتا دەکوڵێ،ئاوەکە لیچ دەبێ، لەپاشان ئاوەکەی لەسەر دادەگرن هەتا کەمێك سارد دەبێتەوە،ئینجا لە پاشان ئاوەکەی بەپارچە قوماشێکی تەنك دەپاڕزن،لەپاشان ئاوەکەی دەخەنە سەر برینەکەو بەپارچە قوماشێکی پاك دەیپێچن،ئەم گیایە لە وەرزی بەهاران دەڕوێ .

٧- پیاز:

ئەم دەرمانە بەکاردێ بۆ نەخۆشی قونێرو بەفرە شینە .

ئامادەکردن و بەکارهێنانی:

سـەلکە پیازێـك دەخەنـە نـاو ئاگرێك،هـەتا پـەلکی یەکـەمی دەســـووتێ، ئینجـــا پیازەکـــە دەردەهێـــنن و تاکـــەمێك دەبێتـەوە،ئینجا پـەلکێکی پـاك دەخەنـە سـەر قونێرەکـە یـان بەفرەشینەکەو بەپارچە قوماشێك جوان دەیبەستن،بەم جۆرە بەردەوامییـــە بـــۆ مـــاوەی چـــەند رۆژێـــك قونێرەکـــە یـــان بەفرەشینەکە چاك دەبێتەوە .

٨- گەنم:

ئەم دەرمانە بەکاردێ بۆ نەخۆشی قونێرو بەفرەشینە .

ئامادەکردن و بەکارهێنانی:

تـۆزێ گـەنم دەهێـنن و بـەدان دەیجوون،ئینجا دەیخەنـە سـەر قونێرەکە یا بەفرەشینەکە،بەپارچە قوماشێك دەیبەستن چەند جارێك بەمجۆرە دەردەبن و چاك دەبنەوە .

٩- شەب:

ئەم دەرمانە بەکاردێ بۆ سەرشکان .

ئامادەکردن و بەکارهێنانی:

پارچـە شـەبێکی دەهێنن،دەیهـاڕن وەك تـۆز ئینجـا لەشـوێنی شـکایەکەی دەدەن و بەپارچـە قوماشـێك دەیبەسـتن،هەندێ جاریش لەگەڵ دۆشاو تێکەڵ دەکەن ئینجا لەشوێنە شکاوەکە دەدەن .

١٠- ئاوی شفتی:

ئەم دەرمانە بەکاردێ بۆ نەخۆشی گورچیلە ئەوانەی بەردیان هەیە ئەگەر زۆری لێ بخۆن دوورنییە چارەسەر بکرێت و بەردەکە فڕێ بدات .

١١- هێلکەو ڕۆن:

خواردنی ئەم دەرمانە سوودی هەیە بۆ کۆخە .

١٢- شیر:

خواردنی ئەم دەرمانەش سوودی هەیە بۆ کۆخە .

١٣- ئاوی شیرتێن:

خواردنی ئەمەش سوودی هەیە بۆ کۆخە .

١٤- کاردی:

ئەم گیایە بەهاریە دەرمانە خواردنی بەچێشت لێنان بەسوودە بۆ ئەو کەسەی کرمی هەیە،کرمەکەی فڕێ دەدات .

١٥- هیلکەو شەب:

ئەم دەرمانە بەکاردێ بۆ نەخۆشی سکچوون .

ئامادەکردن و بەکارهێنانی:

هێلکەی دەکوڵێنن و ئینجا تۆزێ شەبی وردی بەسەر هێلکەکە دەپڕژێنن و دەیخۆن،چەند جارێك بەم جۆرە نەخۆشیەکەی چارە دەکرێ .

١٦- گۆشت:

ئەم دەرمانە بەسوودە بۆ نەخۆشی شەوکوێری .

ئامادەکردن و بەکارهێنانی:

لەناو مەنجەڵێك گۆشتی دەخەنە سەر ئاگرو تا دەکوڵێ،کاتێ کـولا نەخۆشـەکەی دەهێـنن و سـەری بەسـەر مەنجەڵەکـەدا دەگـرێ بـۆ ئـەوەی هەڵمەکـەی لـەدەم و چـاوی بـدات،ئینجا گۆشـتێکی زۆری پێـدەدەن بیخـوا چـەند جارێـك بـەمجۆرە دوبارەی دەکەنەوە .

١٧- خوێ:

ئـەم دەرمانـە بـەکاردەهێنن بـۆ شـوێن ددان کـەوتن تـاوەکو خوێنی لێ نێت .

١٨- سماق:

ئەم دەرمانە بەکاردەهێنن بۆ نەخۆشی دڵ هەڵچوون .

ئامادەکردن و بەکارهێنانی:

تـۆزێ سمـاق لـەناو قاپێك دەکـەن هێـندێ ئـاوی تـێ دەکـەن بەتایبـەتی ئـاوی گـەرم،ئینجا نەخۆشـەکە دەیخـوا هـەتاوەکو بڕشێتەوەو دڵی بەربدا .

١٩- ئاوی تەماتە:

ئەم دەرمانـە بـەکاردێ بـۆ سـووتان،واتە لەشـوێنی سـووتانی دەسوون .

٢٠- ماست:

ئەم دەرمانە بەکاردێ بۆ سووتان،وەکو ئاوی تەماتە لەشوێنی سووتانی دەسوون .

٢١– کەرەوز:

زۆر خواردنی کەرەوز بۆ زۆر بوونی خوێن باشە .

٢٢– کەشك:

خواردنی ئەم دەرمانەش بۆ نەخۆشی زکچوون باشە .

٢٣– ژووشك:

خواردنی ئەم گیانلەبەرە بیکوڵێنی و بیخۆی بۆ نەخۆشی باداری باشە .

٢٤– چاوی مەڕو ماڵات:

ئەم دەرمانە بەکاردێ بۆ نەخۆشی چاوگە .

ئامادەکردن و بەکارهێنانی:

چاوی مەڕێك دەهێنن،لەگەڵ تۆزێك خەنە تێکەڵی دەکەن و دەیخەنە سەر ئاگرێك،لەپاشان دای دەگرن تاکەمێ سارد دەبێتەوە دواتر دەیخەنە سەر برینەکەو بەپارچە قوماشێك دەیبەستن،دوو،سێ جار بەمجۆرە ئینجا چارەسەر دەکرێ .

٢٥– پەلکە گوێز:

ئەم دەرمانە بەکاردێ بۆ نەخۆشی گورچیلە .

ئامادەکردن و بەکارهێنانی:

هەنـدێ پەلکـە تەڕەکـەی دەهێـنن و دەیخەنـە نـاو مەنجـەڵێك هەنـدێ ئـاوی تـێ دەکەن،دەیخەنـە سـەر ئاگر،تـاکو بـاش دەکوڵێ،ئینجـا دەیهێننـە خـوارێ تـا سـارد دەبێتەوە،پاشـان ئاوەکـەی بەپارچـە قوماشـێك دەیارزنن،ئینجـا ئاوەکـەی دەخۆنەوە،بۆ ماوەی چەند رۆژێك .

٢٦- کەرەوز:

ئـەم دەرمانـە وەکـو پەلکـە گـوێز بـەکاردێ بـۆ نەخۆشـی گورچیلە،وەك ئەو ئامادە دەکرێ و بەکار دەهێنرێ .

٢٧- سەفرای زەندی:

خواردنی ئەم دەرمانە بۆ نەخۆشی تا بەسوودە .

٢٨- گلێخە:

ئەم گیایە دەرمانە بەکاردێ بۆ نەخۆشی کولك .

ئامادەکردن و بەکارهێنانی:

کولـك ئەگـەر مووسـەکی لێ بـدەی خـوێنی لێ نـەهات چـاك نابێ،ئەگـەر خـوێنی لێ هـات چـاك دەبێ،بـەم جـۆرە ئامـادە دەکرێ گلێخـە ورد بکـەی و بیخەیـە سـەر کولکەکـە بەپارچـە قوماشێك بیبەستی،چەند جارێك بەمجۆرە کولکەکە نـامێنێ و چارەسەر دەکرێ .

٢٩- گۆشتی رەشان:

زۆر خواردنی گۆشتی رەشان خراپە بۆ نەخۆشی رەشان .

٣٠- شیرینی:

زۆر خواردنی شیرینی خراپە بۆ نەخۆشی خروشت .

٣١- خوێ و سماق و خەنە:

ئەم دەرمانە بەکاردێ بۆ نەخۆشی خروشت .

ئامادەکردن و بەکارهێنانی:

خـــوێ و سمـــــاق و خەنە،هەرســـــێکیان ورد دەکـــــەن و لەخروشتەکەی دەدەن و بەچەند جارێ چارەسەر دەبێ .

٣٢- شەبی ورد:

ئەم دەرمانە بەکاردێ بۆ نەخۆشی کوپوو داڕسان .

ئامادەکردن و بەکارهێنانی:

کـاتێ یـەکێ کـەپووی داڕسـایە شـەبی وردیـان لەکـەپووی دەکرد،بەمجۆرە خوێنەکە رادەوەستا .

٣٣- پیازو سابوون:

ئەم دەرمانە بەکاردێ بۆ نەخۆشی قونێر .

ئامادەکردن و بەکارهێنانی:

پیازو سابوون تێکەڵ دەکەن و لەسەر قونێر دای دەنێن،ئینجا بەپارچە قوماشێك دەیبەستن،بەمجۆرە قونێرەکە دەردەبێ و چارەسەر دەکرێ .

٣٤- خوێواوك:

ئـەم دەرمانــەش بـەکاردەهێنن بـۆ ددان ئێشـان کـەوا چـەند جارێك لەناو دەمیان دەکەن،ئینجا خوێاوکەکە دەڕژێنن .

٣٥- شیرو سماق:

ئەم دەرمانەش بەکاردێ بۆ سووتان .

ئامادەکردن و بەکارهێنانی:

تۆزێ سماق لـەناو ئاو دەکـەن و ئینجا ئاوەکـەی لەگـەڵ شـیر تێکەڵ دەکەن و لەشوێنی سوتان دەدەن .

٣٦- خوێ:

ئەم دەرمانە بەکاردێ بۆ زیپکەی دەم و چاو.

ئامادەکردن و بەکارهێنانی:

پاش ئـەوەی ردێـن دەتراشـی،دەبێ جـوان بیتراشـی هـەتاوەکو خوێنی لێ دێ، ئینجا لەدووایـدا بەخوێ جـوان بشورێ،چـەند جارێك بەمجۆرە نەخۆشییەکە چاك دەبێ .

٣٧- خەنەو قەنەفر:

ئەم دەرمانە بەکاردێ بۆ نەخۆشی بۆنی منداڵان .

ئامادەکردن و بەکارهێنانی:

خەنەی دەگرنـەوەو قەنـەفری دەکـوتن و تێکـەڵی دەکـەن،ئینجا لەسـەری منداڵەکـەی دەنـێن هـەتا دوو سـێ رۆژان هـەتاوەکو بۆنی دێ .

٣٨- ناوکە قەسپ:

ئەم دەرمانە بەکاردێ بۆ نەخۆشی سوکریە.

ئامادەکردن و بەکارهێنانی:

ناوکە قەسپی دەسووتێنن و دەیخۆن .

٣٩- سۆتکە:

ئەم دەرمانە بەکاردێ بۆ نەخۆشی سوکریە .

ئامادەکردن و بەکارهێنانی:

وەك ناوکە قەسپ بەکاردێ

٤٠- پەلکە هەنار:

ئەم دەرمانەش بەکاردێ بۆ نەخۆشی سکچوون.

ئامادەکردن و بەکارهێنانی:

هەندێ پەلکە هەنار دەخەنە ناو مەنجەڵێك و تۆزێ ئاوی تێدەکەن،ئینجا دەیکوڵێنن و دووایی دایدەگرن،کاتێ ساردبۆوە دەیخۆن .

٤١- مێرووستان:

نەخۆشی وەردێنەی پێ چارەسەر دەکەن،بەم جۆرەی خوارەوە، مێرووستانێکی دەهێنن لای پاشووی دەگرن و لای دەمی دەخەنە سەر وەردێنەکە لەلای پاشوو ئەزیەتی دەدەن،مێرووستانەکەش لەلای سەروو دەمی لە وەردێنە دەنێ و گەزەی لێ دەدا،بەمجۆرە وەردێنەکە دەردەبێ و چاك دەبێتەوە .

٤٢- زەردێنەی هێلکە:

ئەم دەرمانە بۆ نەخۆشی وەردێنە بەکاردێت .

ئامادەکردن و بەکارهێنانی:

هێلکەیەکی دەکوڵێنن و زەردێنەکەی دەردەهێنن و کەمێ ساردی دەکەنەوە ئینجا دەیخەنە سەر وەردێنەکە دواتر بەپارچە قوماشێك دەیبەستن،چەند جارێك هەتا وەردێنەکە دەتەقێ .

٤٣- ئاردی نۆکی:

ئەم دەرمانە بەکاردێت بۆ نەخۆشی وەردێنە .

ئامادەکردن و بەکارهێنانی:

هەندێك نۆك دەهێنن و دەیکوتن تاکو زۆر ورد دەبێ،وەك ئاردی لێدێ، ئینجا ئەم ئاردە تۆزێ بەئاو تەڕی دەکەن و لەسەر وەردێنەکەی دادەنێن،بۆ ئەوەی وەردێنەکە بتەقێنێ .

٤٤- مێووژی کوتراو: ئەم دەرمانەش بەکاردێت بۆ لەش کوتراو،واتە یەکێك لێی درابێ،یان بەربووبێتەوە .

ئامادەکردن و بەکارهێنانی:

مێووژی دەهێنن و دەیکوتن،ئینجا لەشوێنە کوتراوەکەی دادەنێن بەپارچە قوماشێك جوان دەیبەستن،چەند جارێك بەمجۆرە دوبارەی دەکەنەوە .

٤٥- هیزە:

بەکاردێت بۆ چارەسەرکردنی ملە ئەستوورە.
ئامادەکردن و بەکارهێنانی:
یەکێ مل ئەستووربێ هێزەی لەملی دەنێن تاوەکو ئەستوورییەکەی چاك دەبێت و دەنیشێتەوە .
٤٦- پێستی جیسك:
ئەم پێستەیە بەکاردێ بۆ ئەو کەسەی لەشی کوترابێ .
ئامادەکردن و بەکارهێنانی:
پێستی جیسکەك دەهێنن لەشوێنی کوتراوەکە دەپێچن .
٤٧- خەزدەر:
ئەم دەرمانە بەکاردێت بۆ نەخۆشی گورچیلە.
ئامادەکردن و بەکارهێنانی:
(بڕوانە: کەرەوزو پەلکە گوێن).
٤٨- حاجیلە:
ئەم دەرمانە بەکاردێت بۆ نەخۆشی ژانە سك.
ئامادەکردن و بەکارهێنانی:
هەندێك لەم گیایە دەهێنن،دەیخەنە ناو مەنجەڵێك تۆزێ ئاوی تێدەکەن ،دەیخەنە سەر ئاگرێك تا دەکوڵێ،ئینجا دایدەگرن تا سارد دەبێتەوە، دواتر ئاوەکەی دەپارزنن،شەوان لەکاتی نووستن دەیخۆنەوە .
٤٩- غەردارە:

ئەو دەرمانەش بەکاردێت بۆ ئەو کەسەی کرمی هەیە .

ئامادەکردن و بەکارهێنانی:

ئـەم گیایـە دەرمانـە بـەزۆری لەچـیای قەرەچـووغ شـین دەبێـت،زۆر خـواردنی ئـەم گیایـە لـەکاتی بەیانی پـێش نـان خواردن گەر کرمت هەبێ دایدەنێی.

٥٠- گۆشت ماسی و بەردەستێ:

ئەم دەرمانەش بەکاردێ بۆ کەوا جێگایەکی شکایە،یا خراپ جێگایەکەی بگیرابایەوە .

ئامادەکردن و بەکارهێنانی:

ئـەو شـکایەی خـراپ بگیرابایـەوە دووبـارە دەیـان شکاندەوە،گۆشـت ماسـی و بەردەسـتی دەکـوتن و لەسـەر شـوێنە شـکاوەکەی دادەنـێن و سـەرلەنوێ شـکانەکەی دەگرنەوەو دەیپێچنەوە،بەردەستێ جۆرە بەردێکە .

٥١- شیروشیرۆك:

ئەم دەرمانەش بەکاردێت بۆ نەخۆشی ددان ئێشە.

ئامادەکردن و بەکارهێنانی:

شیروشیرۆك ناوی گیایەکە کە ئاوشیری تێدایە شیری گیایەکە دەخەنە سەر ددان ئێشەکە،بەم جۆرە چەند جارێك دووبارەی دەکەنەوە .

٥٢- سیر:

ئەم دەرمانەش بەکاردێت بۆ نەخۆشی گەدە،نەخۆشەکە سیری زۆر بخوا باشەو سوودی لێ دەبینێت .

٥٣- پەلکە چنار:

ئەم دەرمانەش بەکاردێت بۆ نەخۆشی خەرکانە.

ئامادەکردن و بەکارهێنانی:

پەلکـــە چـــناری دەهێنن،دەیخەنـــە ســـەر خەرکانەکـــە،جوان بەپارچـــە قوماشـــێك دەیبەســـتن،بەم جـــۆرە چـــەند جارێـــك دووبارەی دەکەنەوە.

٥٤- کل و دارایی:

ئەم دەرمانە بەکاردێ بۆ نەخۆشی چاوئێشان.

ئامادەکردن و بەکارهێنانی:

هێنـــدێ دارایـــی-یـــان دەهێنا،وردیـــان دەکـــردو لەگـــەڵ کـــل تێکەڵیان دەکرد،لە چاویان دەکرد،دارایی ئاوی دارێکە لەچیا شین دەبێت.

٥٥- گوڵە هێرۆو زەردێنەی هێلکە:

ئەم دەرمانە بەکاردێت بۆ نەخۆشی مووە.

ئامادەکردن و بەکارهێنانی:

هێلکەك دەهێنن دەیکوڵێنن ئینجا گوڵە هێرۆی ورد دەکەن و لەگەڵ زەردێنەی هێلکەکەی تێکەڵاو دەکەن و دەیخەنە سەر مووەکە،ئینجا بە پارچە قوماشێك دەیبەستن .

٥٦– گوڵە هێرۆو شیر:
ئەم دەرمانەش بەکاردێت بۆ نەخۆشی مووە،
ئامادەکردن و بەکارهێنانی:
هەندێك گوڵە هێرۆی دەهێنن وردی دەکەن و لەگەڵ شیری مەڕو مالات تێکەلاوی دەکەن،کەمێك لەسەر ئاگر گەرمی دەکەن،ئینجا دەیخەنە سەر شوێنەکەی مووەی لێ هاتووە،لەپاشان بەپارچە قوماشێك دەیبەستن،کاتێ دەربوو مووەکە زەردێنەی هێلکەو ئاردی تێکەڵ دەکەن و لەگەڵ رۆن دەیشێلن و لە سەر مووەکەی دادەنێن یاخود سابوون و هێلکەی تێکەلاو دەکەن و لەسەر قوماشێکی دادەنێن و لەبرینەکەی مووەکە کاتێ دەربووە .
٥٧– ئاوی پیازو هەویری ترش:
ئەم دەرمانەش بەکاردێت بۆ نەخۆشی بۆن.
ئامادەکردو بەکارهێنانی:
پیازی دەکوتن تاکو دەبێتە ئاو،ئینجا ئاوی پیازەکە لەگەڵ هەویری ترشەکە تێکەلاو دەکەن لەسەری منداڵەکەی دەنێن بە پارچە قوماشێك دەیبەستن،هەتاوەکو بۆگەن دەبێت .
٥٨– قاوەو زەردێنەی هێلکە:
ئەم دەرمانەش بەکاردێت بۆ نەخۆشی بۆنی منداڵ .
ئامادەکردن و بەکارهێنانی:

قاوەی دەکوڵێنن و لەگەڵ زەردێنەی هێلکەی تێکەڵاو دەکەن لەسەری منداڵەکە دەنێن و بەپارچە قوماشێك دەیبەستن تاکو رۆژێك یان زیاتر.

٥٩- شەب و زەردێنەی هێلکە:

ئەم دەرمانە بەکاردێت بۆ نەخۆشی بالوکە.

ئامادەکردن و بەکارهێنانی:

هەندێ شەبی دەهێنن و وردی دەکەن لەگەڵ زەردێنەی هێلکە تێکەڵاوی دەکەن و دەیخەنە سەر بالوکەکە ئینجا بەپارچە قوماشێك دەیبەستن .

٦٠- هێلکەو سماق:

ئەم دەرمانە بەکاردێ بۆ نەخۆشی زگکچوون.

ئامادەکردن و بەکارهێنانی:

هەندێ سماق دەهێنن لەناو مەنجەڵێکی دەکەن و تۆزێ ئاوی تێ دەکەن و دەیخەنە سەر ئاگرێك،هێلکەکەی دەهاوێنە ناو سماقەکە تاکو هێلکەکە دەکوڵێ،ئینجا هێلکەکەی دەردەهێنن و دەیخۆن .

٦١- مازی:

ئەم دەرمانە بەکاردێ بۆ نەخۆشی دەم کوڵی منداڵان .

ئامادەکردن و بەکارهێنانی:

قلەمازی دەهێنن و دەیکوتن وەك ئارد،ئینجا لەدەمی دەدەن لەپاش ماوەیەك برینەکە هیشك دەکات .

٦٢- دەرمانی سپی کۆن:

ئەم دەرمانە لەسەر دەمی کۆن هەبوو لەناو شووشەی بوو،لەشارەکان دەیان فرۆشت بۆ نەخۆشی چاویەشان بەکار دەهات،ئەو کەسەی چاوی ئاوی لێ بهاتایەو یاخود بخورایە بەکاری دەهێنا ،دەرمانەکە رەق بوو تۆزێکیان لێ دەکردەوەو دەیان هاوێشتە ناو چاوی ئینجا لەچاوی دەتاواوە،بەم جۆرە بەکار دەهات.

٦٣- ژەنگاری قەلەم:

ئەم دەرمانە بەکاردێ بۆ نەخۆشی چاوخوران و چاو ئاو لێهاتن و چاو تانەی لەسەر بێ.

ئامادەکردن و بەکارهێنانی:

ئەگەر تانەبووایە،تانەکەی سەرچاوی کۆتایی پێدەهات،ئەم دوو دەرمانە حەوت دەرمان بوو،تێکەلاویان دەکرد،رەنگی شین بوو،بەکارهێنانی هێندێك لەم تۆزەیان لەچاوی دەدا،کاتی لەچاودان ئێواران و سبەینان بوو

٦٤- کلکە رێوی:

ئەم دەرمانە گیاییە بەکاردێت بۆ نەخۆشی سك یەشان.

ئامادەکردن و بەکارهێنانی:

ئەم گیایەیان لەگەلٚ هێندیٚ ئاو لەمەنجەلٚێك دەکولاٚند ئینجا ئاوەکەیان دەپارزنی و ئاوەکە دوای ساردبوونەوە دەداپە نەخۆشەکە.

٦٥- زەرەند:

ئەم دەرمانە بەکاردیٚ بۆ نەخۆشی گەدە.

ئامادەکردن و بەکارهێنانی:

زەرەندێك دەهێنن لەپێش ئەوەی بارانی لیٚ دابیٚ،هیشکی دەکەنەوە، دەیدەنە نەخۆشەکە،نەخۆشەکە دەیخوا،دەلٚێن چارەی نۆ نەخۆشی دەکات، لەم نەخۆشیانە حەساسیە،کرمی لەلەشی پاك دەبێتەوە،خوێنی ساف دەبیٚ،بریوانی کۆتایی پیٚ دیٚ.

٦٦- مەرعەی هێلکەو مازی گروان:

ئەم دەرمانە بەکاردێت بۆ سووتان.

ئامادەکردن و بەکارهێنانی:

هێلکەکی دەهێنن خاوە برژی دەکەن،مازووی ورد دەکەن وەکو ئارد،گروانیش ورد دەکەن وەکو ئارد،هێلکە خاوەبرژەکەی دەکوشن ئاوەکی لیٚ پەیدا دەبیٚ پێی دەلٚێن مەرعە،مەرعەکە لەگەلٚ ئاردەمازی و گروانەکە تێکەلاٚو دەکەن ،لەسەر شوێنە سووتاوەکەی دەدەن .

٦٧- پیٚرۆك:

ئەم دەرمانە گیاییە بەکاردێ بۆ نەخۆشی گەدە

ئامادەکردن و بەکارهێنانی:

ئەم گیایەی لەبنی هەڵدەکەنی،بنەکەی لەناو مەنجەڵێك دەکەی و تۆزێ ئاوی تێ دەکەی و ئینجا دەیخەیە سەر ئاگرێك تا دەکوڵێ لەپاشان ئاوەکەی دەپاڕزنن و دوای ساردبوونەوە دەدەنە نەخۆشەکە.

٦٨- دەرمانی زەردەسپی:

ئەم دەرمانە بەکاردێ بۆ نەخۆشی شێرپەنجە لەناو کوردەواری پێی دەڵێن تیراوە

ئامادەکردن و بەکارهێنانی:

ئەگەر شێرپەنجەکە لەهێسکی بوایە هێسکەکیان دەڕنی بەچەقۆ،یا بە دەرمان،ئەگەر لەگۆشتی بوایە ئەم دوو دەرمانەیان تێکەڵاو دەکردو دەیان هاوێشتە ناو کونەکەی ئینجا بەپارچە قوماشێك دەیانبەستا،ئەم دوو دەرمانە لەشارەکان دەیان کڕی .

٦٩- شۆرەو کاری:

ئەم دەرمانە بەکاردێ بۆ ئەو برینەی گوللەی لەناو لەشی بمێنێ.

ئامادەکردن و بەکارهێنانی:

پێشەکی گوللەکەیان دەردەهێناو ئینجا شۆرەو کاری وردی دەکەن و تێکەڵاوی دەکەن لەدوایی لەبرینەکەی دەدەن،دواتر بە پارچە قوماشێك دەیانبەستا،چەند جارێك ئەم دەرمانەی لێ دەدەن برینەکەی چاك دەبێتەوە.

٧٠– مازی و شێن و سۆتکەو شەب:

ئەم دەرمانە بەکاردێ بۆ نەخۆشی دەنگ نووسان.

ئامادەکردن و بەکارهێنانی:

چەند مازی–یەکی تەڕ هێشتا پێڕانەگەیشتبێ،لەگەڵ قلە سۆتکە خڕەکەی بنی لەگەڵ شەب،هەرسێکیان تێکەڵاو بکرێ و بکوترێ ئینجا لە گەروویان دەنا.

٧١– چایەی یەك ڕەنگ و خوێ:

ئەم دەرمانەش بەکاردێ بۆ ددان هێشان.

ئامەدەکردن و بەکارهێنانی:

چایەی یەك ڕەنگیان دەهێناو خوێیان تێکەڵاو دەکردو چایەکەیان تێکدەدا هەتاوەکو خوێیەکە دەتواوە،ئینجا دەیخواردەوە.

٧٢– شۆرەو کاری:

ئەم دەرمانە بەکاردێ بۆ سەر شکان.

ئامادەکردن و بەکارهێنانی:

ئەگەر پەردەی سەر زیانی پێکەوتایە دەمریٚ،ئەگەر پەردەی سەر زیانی نەهێنایە کاری و شۆرە دەکوتن وەکو ئارد،لەشوێنی شکایەکەی دەدەن و بە پارچە قوماشێك دەیبەستن.

٧٣- پەلکە زەرەند:

ئەم دەرمانە بەکاردیٚ بۆ نەخۆشی قەرەشتی.

ئامادەکردن و بەکارهێنای:

زەرەندیان دەهێناو پەلکەکەیان لەسەر شوێنی قەرەشتەکەیان دادەناو بەپارچە قوماشێك دەیانبەستا.

٧٤- زەرەند:

ئەم دەرمانە بەکاردیٚ بۆ نەخۆشی (تا).

ئامادەکردن و بەکارهێنانی:

زەرەندیان دەهێنا کەوا بارانی پێنەکەوتایە وشکیان دەکردەوەو دەیاندایە نەخۆشەکە دەیخوارد،بەمجۆرە بۆ نەخۆشی ژانە سەریش بەکار دەهات.

٧٥- لباد لە خوێواوك کوڵاندن:

ئەم دەرمانەش بەکاردیٚ بۆ نەخۆشی باداری.

ئامادەکردن و بەکارهێنانی:

پارچەیەك لەلباد دەهێنن و هەندێکیش ئاو دەهێنن و خوێی تیٚ دەکەن ، لبادەکەی دەهاوێنە ناو ئاوو خوێیەکە،ئینجا

دەیخەنە سەر ئاگرێك،هەتا ئاوەکە دەکوڵێ،دواتر ئاوەکەی دێننە خوارێ لبادەکەی لەناو ئاوو خوێیەکە دێننە دەرێ تا کەمێك سارد دەبێتەوە ئینجا پارچە لبادەکەی لە شوێنە باداری-یەکەی دەدەن و بەپارچە قوماشێك دەیبەستن،دوو ،سێ رۆژ بەمجۆرە .

٧٦- روڵك:

ئەم دەرجانە دەرمانە بەکاردێ بۆ نەخۆشی باداری .

ئامادەکردن و بەکارهێنانی:

هەندێك لەلقی دار روڵك دەهێنن و وردی دەکەن لەگەڵ تۆزێ ئاو دەیخەنە ناو مەنجەلێك و دوایی دەیخەنە سەر ئاگر تا دەکولێت،کاتێ کوڵا ئاوێکی چەورو لیچ لەدارەکەی دێتە دەرێ بەم ئاوە چەورەو لیچە دەڵێن مەرحەمی روڵك ئینجا لەپاشان لقە دارەکان دەهێننە دەرێ و مەرحەمی روڵکەکە لە شوێنە باداری-یەکەی دەدەن و پێی چەور دەکەن،چەند جارێك بەمجۆرە .

٧٧- زەنجەفیل:

ئەم دەرمانە بەکاردێ بۆ نەخۆشی کۆخە.

ئامادەکردن و بەکارهێنانی:

کەمێك لەزەنجەفیل دەهێنن لەگەڵ هەندێك ئاو لەنێو شتێك دەیکوڵێنن، دواتر ئاوەکە دەهێننە خوارێ کاتێ ئاوەکە

کەمێك سارد بۆوە دەیخۆن، هەروەها زۆرجار لەگەڵ شیر تێکەڵی دەکەن،ئینجا دەیخۆن .بەمجۆرە چەند جارێك دوبارەی دەکەنەوە.

٧٨- شیلاوی ئاوی بڕوش و شەکرو شەب:

ئەم دەرمانە بەکاردێ بۆ نەخۆشی بەفرەشینە.

ئامادەکردن و بەکارهێنانی:

شیلاوی ئاوی بڕوش دەکوڵێنن،ئاوەکە توند دەبێ،ئینجا لەسەر بەفرەشینەکەی دادەنێن و بەپارچە قوماشێك دەیبەستن،بەم ئاوە دەردەبێ و ئینجا شەکرو شەبی وەرد دەکەن و بەتێکەڵاوی لەسەر کونی بەفرەشینەکەی دادەنێن،چەند جارێك بەمجۆرە دوبارەی دەکەنەوە، بەمجۆرە چارەسەر دەکرێ.

٧٩- شینك:

ئەم دەرمانە بەکاردێ بۆ گڕووبوون.

ئامادەکردن و بەکارهێنانی:

پەلکی ئەم گیایە هیشك دەکەنەوەو لەدوایی لەنێو ئاون دەیکوتن و لە شوێنە گرووەکەی دەدەن و ئینجا بەپارچە قوماشێك دەیبەستن،چەند جارێك بەمجۆرە دوبارەی دەکەنەوە.

٨٠- گلێخەبەرازە:

ئەم دەرمانە بەکاردێ بۆ نەخۆشی بالوکە.

ئامادەکردن و بەکارهێنانی:

گلێخـــەکی لەبنـــەوە هەڵـــدەنی و ســـەلکەکەی دەردەهێنـــی و نێرکەکـــەی دەخەیەنـــە ســـەر بالوکەکـــەو بەپارچـــە قوماشـــێك دەیبەستی،دوو سێ ڕۆژ ئەم دەرمانەی لێدەدەی.

٨١- پیاز:

ئەم دەرمانە بەکاردێ بۆ پزدووك.

ئامادەکردن و بەکارهێنانی:

سەلکە پیازەکی لەبن ئاگر دەنێن هەتاکو دەبرژێ،ئینجا ئینجا دەری دەهێنن تا کەمێك سارد دەبێتەوە،لەدوایی پەلکەکەی دەخەنە سەر پزدوکەکە،بەپارچە قوماشێك دەیبەستن.

٨٢- دارکەتووتن:

ئەم دەرمانە بەکاردێ بۆ چاو هێشان.

ئامادەکردن و بەکارهێنانی:

دارکەکی دەهێنن،تەنها دارکەکەی بێ پەلك،ئەم دارکەی لەناو ئـــاو دادەنـــێن تـــاکو نـــەرم دەبێ،ئینجـــا دارکەکـــە لەچـــاوی وەردەدەن،بەم جۆرە ئازاری نامێنێ.

٨٣- زەرەندی سپی کراو:

ئەم دەرمانەش بەکاردێ بۆ نەخۆشی سك ئەستوور بوون.

ئامادەکردن و بەکارهێنانی:

زەرەندێك دەهێنن سپی دەکەن،بەڵام دەبێ ئەم زەرەندە نەکار بێ و نەپیر، کاتێ زەرەندەکەیان سپی کرد،ئینجا کوزەکی لێدەکەنەوەو تۆزێ شەکری پێوە دەکەن،ئینجا دەیدەنە نەخۆشەکە بیخوا،هەرکاتێ زەرەندەکەی خوارد لەناو سکی دەتەقێ،لەمکات واباشە نەخۆشەکە بگەڕێ،دواتر سکی دەست بەقوڕە قوڕ دەکات،لەدوایدا نەخۆشەکە چاك دەبێتەوەو ئازاری نامێنێ.

٨٤– پەلکی داری رەشی کەرەك:

ئەم دەرمانە بەکاردێ بۆ نەخۆشی تیراوە (سەرەتان).

ئامادەکردن و بەکارهێنانی:

پەلکە داری رەشی کەرەك ورد دەکەن و تێکەڵ قیری قەننە دەکرێت و تێکەڵاوی دەکەن،لەپێشەکی ناوبرینەکە دەبێ خاوێن بکرێتەوە هەتاکو خوێنی لێ دێ،ئینجا دەرمانەکەی لەبرینەکەی دەدەی و بە قوماشێك دەیبەستی دوو،سێ جار بەمجۆرە دوبارە دەکرێتەوە نەخۆشەکە چاك دەبێتەوە.

٨٥– لیمۆن دزی:

ئەم دەرمانە بەکاردێ بۆ نەخۆشی لووت داڕسان.

ئامادەکردن و بەکارهێنانی:

کاتێ لووت داڕسا،تۆزێ لیمۆن دزی لەناو ئاوێك دەکەین،ئینجا بەپارچە لۆکەیەك دەیهاوێنە ناو لووتی.

٨٦- داری رەشکی کەرەك:

ئەم دەرمانە بەکاردێ بۆ نەخۆشی مایەسیری.

ئامادەکردن و بەکارهێنانی:

رێیەکی واتە رەگی داری رەشکی کەرەك دەهێنن،بەئاوی شیرتێن تارەتی نەخۆشەکە هەڵدەگری و دارەکەی دەهێنن هێندەی قۆنکی جغارەك بەچەقۆ پەلکەکەی سەری هەڵدەگری نیو سەعات دەبێ نەخۆشەکە خۆی لەبەر رابگرێ،برینەکەی بەخوێن دێ و خوێنێکی رەشی لێ دێ لەپاشان دەشوورێ، بەمجۆرە چارەسەر دەکرێ و دەڵێن جارێکیتر ئەم نەخۆشیە ناگرێ.

٨٧- شینك:

ئەم دەرمانە بەکاردێ بۆ نەخۆشی کولك و بەفرەشینە.

ئامادەکردن و بەکارهێنانی:

ئەم گیایە وشك دەکەنەوەو دەیکەنە تۆز،ئینجا تۆزەکەی لەبرینەکەی دەدەن و دەیبەستن،ئەگەر برینەکە کۆنیش بێ چاکی دەکاتەوەو قووڵیش بێ پڕی دەکاتەوە.

٨٨- مازی تەڕ:

ئەم دەرمانە بەکاردێ بۆ نەخۆشی وەك قونێر،کولك، بەفرەشینە،هەروەها بەگشتی بۆ برینی تەڕ.

ئامادەکردن و بەکارهێنانی:

هەندێ مازی شین دەهێنن و دەیکوتن،لەپاشان لەبرینەکەی وەردەکەن و دەیبەستن،دوو سێ ڕۆژ بەم جۆرە برینەکە چاك وشك دەکات و چاك دەبێ.

٨٩- ڕازیانەمار:

ئەم گیایە دەرمانە بەکاردێ بۆ نەخۆشی قەرەشتی.

ئامادەکردن و بەکارهێنانی:

بنی ئەم گیایە هەڵدەکەنی و سەلکەکەی دەردەهێنی و دەیکەی بەدوو کەرت ئینجا کەرتەکان لەیەك دەخشێنی لەئەنجامدا کەفی دەکات،کەفەکەی لە قەرەشتیەکەی دەخشێنی بەمجۆرە دوو سێ جار دوبارەی دەکەیەوە قەرەشتیەکە چاك دەبێتەوە.

٩٠- گونەسەگ:

ئەم دەرمانە بەکاردێ بۆ نەخۆشی گۆشت پیس بووبێ و ڕزی بووبێ،واتە بۆ کرمی بوونی برین.

ئامادەکردن و بەکارهێنانی:

ئەم گیایە دەهێنن و پەلکە هیشکەکەی ورد دەکەن وەك ئارد،ئینجا ئەم ئاردە بەبرینەکەی وەردەکەن لەپاشان بەپارچە قوماشێك دەیبەستن بەم جۆرە چەند جارێك دووبارەی دەکەنەوە چاك دەبێتەوە.

٩١- برایم بۆگەن:

ئەم دەرمانە بەکاردێ بۆ نەخۆشی کولك و بەفرەشینە لەکاتی ئەستوور دەبێ و دەرنابێ.

ئامادەکردن و بەکارهێنانی:

گیایە تەڕەکەی دەهێنن و ورد وردی دەکەن و دەیخەنە ناو مەنجەڵێك و تۆزێ ئاوی تێدەکەن و دەیخەنە سەر ئاگرێك،تاکو دەکوڵێ،ئینجا ئاوەکە دادەگرن و تا سارد دەبێتەوە،بۆ ماوەیەکی کەم سەرتووەکی لێ پەیدا دەبێ ،ئینجا سەرتووەکەی لەشوێنە ئەستوورەکەی دەدەن،بەتایبەت ئێواران بۆ بەیانی ئەستوورەکەی نامێنێ و چاك دەبێتەوە.

## سەرچاوە

١- سۆفی ناسراو بە مام خاجی سۆفی،خوارزای فەقێ حوسێنی مەنتك كەوا شاگردی خالی بووە،ئێستا لەهەولێر دادەنیشێ و لەدایك بووی ساڵی ١٩٢١ ٢- رۆشنبیری نوێ،ژمارە ٩١ نیسانی ١٩٨٢ ،نووسینی عەبدولڕەقیب یووسف.

*** تیبینی:**

ئەم نووسینە لەساڵی ١٩٨٧ نووسراوەو بەڵام بەهۆی زروفی تایبەتی خۆم لەبڵاوكردنەوە دواكەوت.

---

* لەگۆڤاری كاروان ،ژمارە ١١١ ئایاری ١٩٩٧ ،گۆڤارێكی رۆشنبیریی مانگانەیە وەزارەتی رۆشنبیری حكومەتی هەرێمی كوردستان بەڕێوەبەرایەتی گشتی رۆشنبیری و هونەر دەری دەكات بڵاوم كردۆتەوە.

٩٢- توێكڵی وشكی هەنار:

یەكێك بەهۆی كاركردن لەوەرزە ساردەكان، كە دەست و پێی شەق دەبوو یاخود بڵێین دەقەرشایان پێی دەگوت، كە بریندار

دەبوو, ئینجا بۆ چارەسەری توێکڵی وشکی هەنار لەنێو ئاون دەکوتراو دواتر لەگەڵ خەنەتێکەڵیان دەکرد و لەپاشان بەئاو دەگیراوە، ئێواران لەشوێنی برینەکەیان دەداو بەپارچە قوماشێك دەبەسترا، بەم جۆرە چەند جارێك ئەم خەنەو هەنارە وردەکراوەیان لێ دەدا, بەهۆیەوە برینەکە نەدەما و چاك دەبۆوە، چوونکە بەمە پێستەکە پتەو دەبوو.

---

* لەگۆڤاری دەنگی پێشمەرگە ژمارە ١٣٢ ئادار ٢٠٠٩ بلاوم کردۆتەوە

٩٣- گوێز:

جاران یەکێك مارپێوەی بدابایە بۆ چارەسەرکردنی چەند دانە گوێزێکیان دەهێنا و دەیانسوتاند مشکیەکەیان بەسەر شوێنی پێوەدانەکەی وەردەکرد.

---

* لەگۆڤاری دەنگی پێشمەرگە ژمارە ١٣٢ ئادار ٢٠٠٩ بلاوم کردۆتەوە

٩٤- گروان:

گروان وەك هەرمێ و داربەڕووە، بۆ نەخۆشی برین باشە، ئامادەکردنی هەندێك لەو دارە دارە دەهێنن، وشکی

دەکەنەوەو دواتر دەیکوتن، چەند جارێك بەشوێن برینەکەی وەردەکەن و بەهۆیەوە وشك دەبێت و چاك دەبێتەوە

٩٥– رەزرەزۆك: ئەم گیایە بەزۆری لەناو شوێنی کشتوکاڵی دەڕوێ، ئەم دەرمانە بەکاردێ بۆ ئەو کەسەی پەنجەی دەبێتە برین بە تایبەت ئەوانەی بەهۆی کرم، ئەم دەنکی رەزرەزۆکەکە لەناو ئاون دەیکوتن، ئینجا بەئاگر رەزرەزۆکەکە دەسووتێنرێ و شـوێنی برینەکـە لەسـەر ئاگرەکـە رادەگـری و بەدەسـت لەپشتەوەی برینەك دەدەی کرمەکە بەخۆی دێتە دەرێ

٩٥– جاترە:

ئـەم گیایـە لەشـێوەی رەیحانـە بـەڵام وردتـرە، تـام و بـۆنی زۆر خۆشـە، بـەهاران لەناوچـەی شـاخاوی هەیـە، ئـەو کەسـەی هەناسە سواری هـەبێت هەندێك لـەم گیایە بەوشـکی یـان بە تەڕی دەیهێنن دەیکوڵێنن و ئاوەکەی دەخۆنەوە، هەروەها ئەم گیایە بۆ شیو بەتایبەت شیوی مەرەگەی نۆك و کفتـەو لەگەڵ چەندان شیوی تر دەکرێت.

٩٦– زەرەند:

زەرەنـد وەك گنـدۆرەی دێمێیـەو لەدەشـت دەڕوێ و زۆر تاڵـە، خواردنی بۆ نەخۆشی مایەسیری و شەکرەو ئەوانـەی کرمیـان هەیـە بەسـوودە، نەخۆشـە کـە زەرەندەکـە بـەکوزکراوی وەك گندۆرە دەخوات، چەند جارێك.

٩٧- خەزەرۆك:

ئـەم گیایـە بـەردەوام سـەوزەو رەنگـی لەشـێوەی کـەرەوزەو لەناوچـە شـاخەویەکان هەیـەو ئـەوەی گورچـیلەی ئـازاری هـەبێت، هەنـدێك لـەم گیایـە دەهێـنن و دەیکـوڵێنن و تـاوەکو رەنگـاو دەدات، دوایـی سـۆپاتەکەی لێ دەگـرن و بـۆ مـاوەی چەند رۆژێك لەکاتی بەیانی لە خرێنی ئاوەکەی دەخۆن.

٩٨- سۆتکە:

ئـەم گیایـە بـەکاردێت بـۆ ئـەو کەسـانەی دەسـت و پێیـان قەرشـتیە، یـاخود خورشـتی هەیـە، ئـەم گیایـە لـە بـەهاران دەڕوێ، کەسـەری گیایـە دێتـە دەرێ و رەنگـی پەمبەیـە دوای ئـەوە بەپیشـەقان هـەڵی دەکـەنن، وردی دەکـەن و جـوان دەیشـۆنەوەو وردی دەکـەن و دواتـر دەیکـوڵێنن، دەبێـت بەمەرحـەم و لـەناو شـتێك دایـدەنێن و مـاوەی چـەند رۆژێـك لەشوێنە قەرەشتیەکە دەدەن و بەهۆیەوە چاك دەبێتەوە .

٩٩- گر

ئەم جۆرە دەرمانەیان بەکار دەهێنا بۆ زۆر شت لەوانە ئافرەت وەك خەنـە لەسـەریان دەنـا بـۆ ئـەوەی پەرسـیان نـەرم بێـت، هەروەها ئەو کەسانەی خورشت یان قینچکەی وەکو نەخۆشی خەرکانـەیان هـەبوو ئـەو گرەیـان دەهێنـا لـەئاویان دەکـردو کەنەرم بۆوە خۆیـان پـێ دەشووشـت، ئـەم گـرەش تـەنها لـەناو

دۆڵ و شاخەکانی کوردستان دەست دەکەوێ، ئەو جێیانەی کەلێی دەست دەکەوت کۆمەڵێك ئافرەت خڕدەبوونەوەو گوێدرێژو خاکەناسیان دەبردو خاکەکەیان هەڵ دەدڕی تاکو دەگەیشتە گرەکە چونکە گر لەبن قەسپۆکە، سەرەتا دەبێ قەسپۆکەکە لابەن تاوەکو گرەکە کەبەدیار دەکەوێ ڕەنگی قەسپۆکەکە سوورەو ڕەنگی گریش شینە، کە بەدیار دەکەوت ئینجا بەخاکەناسان لەناو تێرکەیان دەکردو دەیان هێناوە ماڵ و لەسەر بانی هەریان دەخست تاوەکو هیشك دەبۆوە ئینجا هەڵیان دەگرتەوەو ئەو کاتەی حەزیان دەکرد بەکاریان دەهێنا.

١٠٠- داری میکۆکە:

ئەم دەرمانە بەکار دێت بۆ ژانە سك، بۆ ئامادەکردنی هەندێك لەکۆلکەکە دەهێنن و جوان پاکی دەکەنەوەو لەناو ئاو دەیکوڵێنن و دواتر دەیپاڵێون، ئینجا دەدرێت بە نەخۆشەکەو دەیخوا.

١٠١- خڕنوك:

جۆرە دارێکی دڕکاویەو بەهاران شین دەبێتەوە، واتە دەڕوێتەوە، داری خڕنوك لە دەشت شین دەبێت، واتە سروشتیە، دواتر خڕنوك دەگرێت کە نزیکەی بەقەدەر دانە قەسپێك دەبێت، بەتەڕی دەخورێت و دواتر لەکۆتایی وەرزی

بەهار وشك دەبێت و پێی دەڵێن مەحچەچە، ئینجا لەكاتی وشك كردنی چەند دانەیەك لەنێو ئاون ورد وردی دەكەن، ئەو كەسانەی نەخۆشی شەكرەو گورچیلەیان بەردی هەیە لەكاتی بەیانی بەنانی دەیخۆن .

١٠٢ – قژ هەڵوەرین

بۆ چارەسەر كردنی ((قژ هەڵوەرین ))

ئەوشتانەی كەبەكار دەهێنرێ ئەمانەن

رۆنی كەرەی خۆماڵی /

واتە دوای توانەوەی كەرە رۆنێكی زەردی هەیە ئەو رۆنە بەكار دەهێنرێ و لەگەڵ

خوبا / ئەم دەرمانی لای عەتارەكان هەیە

خوبا لەگەڵ رۆنی كەرە تێكەڵ دەكرێ پاشان پێستی سەری باش پیێ چەور دەكرێ پاش دوو كاتژمێر خاوێن دەكرێتەوە بێ ئەوەی هیچ جۆرە سابونێك یا شامپۆ بەكار بهێنرێ ئەبێ بە ئاوێكی شیلەتێن خاوێن بكرێتەوە .

ئەمە هەفتەی جارێك بۆماوەی شەش مانگی بەردەوام دەبێ .

لەدەست كەچەڵی رزگارت ئەبێ .

بۆ چارەسەر كردنی نەخۆشی باداری

لەکۆنەوە کورد ئەم ڕێگا چارەیە یان بەکارهێناوە . بەتایبەت ئەو کەسانە کە چونەتە نێو ساڵەوە .
ئەو شتانەش کەبەکار دەهێنرێ .
١. موسێکی پاك
٢ـ کەڵە شاخێك ، واتە شاخی ئاژەلێکی پاك ناو شاخەکە خاوێن کرابێتەوە
٣. پارچە خامێکی خاوێن بەکار نەهێنرابێ .
ئەو شوێنە کە زۆر دێشی بە موسەکە دوو شەقی بچووك دەکەین بە هێمنی بەشێوەی (نیشانە =+ یاخود نیشانەی کۆ لەبیرکاری )
دوای ئەوە کەڵەشاخەکە دەنێینە بەردەم برینەکەوە تاوەکو خوێنە ڕەشەکە تەواو دێتە دەرێ پاش ئەو خوێنیکی سوری گەش دێت دوای ئەوەش برینەکە خاوێن دەکەیتەوە بە پارچە خامەکە دەیبە

١٠٣– دەرمان

١ـ ناوکی زەیتون بسوتێندرێ و دووکەلەکەی هەل بمژرێ . بۆددان ئێشان و نەخۆشی سینگ باشە .
٢. ناوکی گوێز بخوسێندرێ و لەدەم وەربکرێ ددان و پووك پتەو دەکات .

٣. گەڵای زەیتون بکوشرێ و ئاوەکەی بکولێنرێ و ناو ماڵی پێ برشێنرێ ئەوا هەموو جۆرە میکرۆبێکی زیان بەخش لەناو دەبات .

داری ژاڵە

داری ژاڵە پەلکەکەی لێدەکەیتەوە دەیشۆی ئینجا جوان دەیکولێنی ، ئاوەکەی دەپاڵیوی ئینجا بەسەر برینی کراوە دادەکرێ ، بەدوو سێ جار چاکی دەکاتەوە .

١٠٤- توور

تورێکی گەورە وەك تەماتە چۆن بۆدۆڵمە ناوەکەی دەردێنی بەم جۆرە وای لێ دەکەی دواتر پڕی ئاو دەکەی و سەرەکەی دەخەیەوە سەری ئینجا تا بەیانی لێی گەرێ دواتر بەیانی ئاوەکەی لە خرێنی بخۆیەوە ، بۆ ئەو کەسەی بەردی هەیە باشە بەردەکەی فرێ دەدا .

١٠٥- زەردێنەی هێلکە و شیری مەڕو ماڵات

شیر دەکولێنی جوان بەس زەردێنەی هێلکەی تێ دەکەیە ناو شیرە کولاوەکە واتە زەردێنەکە ،هێلکەکە بەخاوی نەی کولێنی ئەوکەسەی مەعیدەی دێشێ سبەینان و ئێواران بەخرێنی بیخوات زۆر باشە بۆمەعیدەی

### ١٠٦- خەزەر

خەزەر ئەو گیایەیە لەدەوری کانیاوەکان شین دەبی واتە دەرویێت وەك کەرەوز وایە ئەوەی مەعیدەی بێشی بیخوات باشە

### ١٠٧- هێلکە

بۆ سوتان . هێلکەکەیان دەشکاند زەردێنەکەیان لەناو قاپێك دەبرژاند هەتا دەبوو بەرۆن . ئەوجا سارد دەبووەوە . لەسەر برینەکەیان دادەنا بە پەرۆکەکی

**گیای گورەزە**

سودی هەیە بۆ برژان بەتایبەت کە زەردەواڵە پێوەی دابیٚ . یان دووپشك یان مار ئە گیایە لەناو ئاون بی کوتی دوایی لەسەر شوێنی پێوەدانەکە بە پەرۆیەك جوان دەیبەستی .

### ١٠٨- دار گێوژ

دار گێوژ هەیە لەناوچە شاخاویەکان شین دەبی ، پەلکەکانی بینی جوان بیشۆوە جارێك بیکوڵنە و دوای ئاوەکەی لیٚ برێژە جاری دووەم بی کولێنەوە وە ئاوەکەی جوان بپارزنە و وە دەدرێتە ئەو کەسانەی کە نەخۆشی کلیەیان هەیە .

١٠٩- هەمبانە

لەناو کوردەواری دا لەمێژە خاوەن مەرو ماراتەکان پیستەی مەرو ماراتیان کردیتە هەمبانە بۆئەوەی ساوارو بروش و دانە وێرەی تێدا هەڵبگرن بۆ پاك و خاوێنی دانە وێرەکە ئینجا ئەم هەمبانەیە دەینا دەیانکردە ناو ئاوی گەرم بۆئەوەی نەرم بێتەوە چونکە رەق بوو دوای پارچە پارچە یان دەکرد دەیان خستە سەر ئەو شوێنەی کە ئێش و ئازاری هەیە تاماوەیەك لەسەر ئەم جێگایە دەماوە تاچاك دەبۆوە .

١١٠- قەنەفر و خڕنوك

یەکێك گەدەی بێشایە هەندێك قەنەفرو خرنوك ،خرنوك کە گیایەکە وشك دەبیٚ ، کە ئەو بەرەی پێوەیتی پیٚ دەڵێن ماحچەچە و ماحچەچەکە و ئەبات و قەنەفرو لەناو ئاویان تێدەکرد و نەخۆشەکە بەیانیان و ئێواران بۆگەدە باش بوو .

١١١- هێلکە بەخاوی

ئەگەر کۆخەی هەبوایە لەپاش نان خواردن هێلکەیەکی بەخاوی بەبیٚ کولاّن لەناو جامەکی دەکرد و دەیخوارد بەهۆیەوە چاك دەبۆوە

١١٢- گۆگەم

ئەم دەرمانە بەکاردیٚ بۆنەخۆشی ژانی چۆك

ئامادە کردن و بەکارهێنانی ،
ئەم گیایە رەنگی وەکی پەلکە مێوە لەمێگان زۆرە ، هەندێك گۆگەم دەینی ، لەناو مەنجەلێك هەنەك ئاوی تیْ بکەن و بیکوڵنی ئینجا لەسەر چۆك دایبنیْ و بەپارچە نایلۆنەك بیپێچە بۆماوەی چەند رۆژەك .

١١٣- پیاز و سابوون

پیازو سابوون ورد دەکەن بۆ قونێر تاوەك و دەردە بی وجا بەهۆیەوە چاك دەبۆوە

١١٤- سماق و پیاز

هەردووکیان دەهێنن تێکەلیان دەکەن ، ئینجا دەیانکوڵێنن، لەپاشا دەیان خەنە ناو پارچە پەرۆیەکی تەنك تا ئاوی لیْ دیْ ئەم ئاوە بۆ بوژانەوەی سەر لەکاتی شکان بەکاردیْ لە جیاتی سپرتۆ

١١٥- شەب و هێلکە

شەبەکە دەهێنن و وردی دەکەن و لەگەڵ هێلکەیەکی مەیلەو دەڵمە تێکەلاوی دەکەن ئینجا نەخۆش فری دەکات بۆ کۆکەو هەناسە تەنکی بەسوودبوو

### ١١٦- پونگ

پونگ گیایەکی سەوزەو جوانە و ئەم گیایە بۆ درە کزە بەکاردەهێنن هەندێك لەو گیایەی دەهێنن و دەیشۆنەوە و دەیخوات درەکزەکەی چاك دەبێت .

### ١١٧- بنە گۆگەم

ئەوەی ددانی بێشی پارچەك لەم بنە گۆگەمە دەهێنن ، کۆلکەکەی لەگەڵ ئاو تێکەڵاوی دەکەن و دەیکوڵێنن لەپاشان دایدەگرن تابرەك سارد دەبێتەوە ئینجا دەدرێتە نەخۆشی بۆئەوەی لەدەمی وەردەکا و ژانەکەی نامێنێ

### ١١٨- گیا برین

ئەم گیایە لەکاتی بەهاران شین دەبی ، کەلەشێوەی پەمۆ دەچێ ، دەبێ بەتەری بیکەی ، لەبەر رۆژ دای نێی تاوشك دەبێتەوە ، ئینجا ئامادەکردنی ورد وردی دەکەی هەرجێگایێك برین بیت بەبرینەکەی وەردەکەی وشکی دەکاتەوە .

### ١١٩- خورما

جاران لەکوردەواری ئەوکەسەی لەکارکردن هیلاك بوایە کاری لەپشتی بکردایە ، واتە پشتی بهێشایە ئەوە

بۆچارەسەرکردنی ، لەپێك خورمایان دەهێناو ناوکەکەیان دەردەهیناو دواتر دەستیان بەرۆن چەور دەکرد و ئینجا خورماکەیان دەشێلا تاوەکو وشك دەبوو، ئینجا خورماکەیان لەسەر لەسەر پشتی یان دەکردەوەو بەپارچە قوماشێك دەیانبەست ، بەزۆری لەکاتی ئێوارە تاوەکو بەیانی و بەم جۆرە چەند رۆژێك بە بەردەوامی دووبارەیان دەکردەوە .

---

لەگۆڤاری دەنگی پێشمەرگە ژمارە ١٤١ کانوونی یەکەم ٢٠٠٩ بلاوم کردۆتەوە

١٢٠- چەور کردن

جاران لەکوردەواری کەمندالێك نەخۆش بکەوتایە و تووشی نەخۆشی سك چوون ببوا ئەوە پشتیان دەدایە بەرئاگر و بەرۆن چەوریان دەکرد و چەند رۆژێك ماستیان لێ دەدا ، ئینجا لەژێر نوێنێکی گەرم دایان دەپۆشی .

---

لەگۆڤاری دەنگی پێشمەرگە ژمارە ١٤٢ کانوونی دووەم ٢٠١٠ بلاوم کردۆتەوە

١٢١- ماست

لەسەردەمی کۆنی کوردەواری یەکێك کەسەری کەچەڵ و گڕ دەبوو بۆ چارەسەری بەگوێرەی پێویست هەندێك ماستیان

دەهێنـاو لـەنێو مەنجـەڵێك دەیانخسـتە سـەر ئاگرێك و تۆزێـك خوێیان تێ دە کرد تاوەکو تەواو دەکولاّ ئینجا دەیـان هێنایـە خـوارەوە تـاوەکو سـارد دەبـۆوە ، لەپاشـان ماسـتەکەیان لەشـوێن کەچـەڵیەکەی یـاخود گڕوەکـەی دەدا بەتایبـەت لـە ئێـواران ، ئینجـا پارچـە قوماشـێك دەیانبەسـت بەمـە تفـری هەڵـدەدا ، واتـە چـەرم ، بـەم جـۆرە چـەند جارێـك دووبـارە دەکرایەوە ، لەئەنجام چارەسەر دەبوو.

لەگۆڤاری دەنگی پێشمەرگە ژمارە ١٤٣ چوبات ٢٠١٠ بلاّوم کردۆتەوە

١٢٢- گوێ هێشان

جاران لەکوردەواریـدا بەتایبـەت لەگوندەکانـدا یـەکێك گـوێی بهێشـایە ئـەوە بـۆ چارەسـەر پـەنایان دەبـردە بـەر چـەند داوو دەرمانێـك ، لەوانـە کاغـەزی شـینیان دەکـردە لوولـەو لـەناو گوێیـان دەنـاو بەدووکـەڵی جگـەرە قـەنگیان دەدا ، واتـە دووکەڵیان دەخستە نێـو گوێیەکە بەهۆی لوولەکە ، هـەروەها زیوانیـان دەکوتـاو دواتـر دەیانخسـتە نـاو قاپێـك و هەنـدێ شیری تێ دەکراو لەسەر ئاگر دادەنرا تـاوەکو دەکولاّ ، دواتـر لەسەر ئاگرە دەیان هێنایـە خـوارەوە و تـاوەکو سـارد دەبـۆوە ئینجا بەدڵۆپ لەگوێیەکە دەکرا .

لــەگۆڤاری دەنگــی پێشــمەرگە ژمــارە ١٤٧حــوزەیران ٢٠١٠ بــلاّوم کردۆتەوە .

۱۲۳- خڕنوك و ماست

کەمێك خڕنووك بەسەوزی دەهێنن و وردی دەکەن ، دواتر لەگەڵ سەرتووی ماست تێکەڵاو دەکرێت و دەخرێتە سەرشوێنی بەئازار بەتایبەت چاو ، کاتی بەکار هێنراوەکەش زێتر لەکاتی ئێوارەیەو بەپارچە قوماشێکی پاك دەبەسترێت .

---

لەگۆڤاری دەنگی پێشمەرگە ژمارە ۱٤۸ تەمموز۲۰۱۰ بڵاوم کردۆتەوە

۱۲٤- شاتوو

جاران لەکوردەواری ئەوەی تووشی نەخۆشی قورگ ئێشەو ملەخڕێ ببوایە ، ئەوە بۆچارەسەر کردنی شاتوو یان دەگوشیوەو خڵەکیان لەسەر قورگ و شوێنە ئاوساوەکە داناوە و بە پارچە پەرۆیەکی پاك بەستویانە ، ئاوەکەشی رۆژێ چەند جار داویانە بەنەخۆشەکە .

---

لەگۆڤاری دەنگی پێشمەرگە ژمارە ۱٤۹ ئاب ۲۰۱۰ بڵاوم کردۆتەوە

۱۲٥- شیر شیرۆك

شیر شیرۆك وەك پنچکە ، یەکێك لە دەرمانە کوردەواریەکان هەرلەکۆنەوە بۆ نەخۆشی هیشکە بیرۆ بەکاردێت ، شیر شیرۆك لەدەشت زۆرە ، ئەوکەسەی تووشی هیشکە بیرۆ دەبیت دەچێتە دەشت کەپەلکەکی لێ دەکەیتەوە پشکەکی

وەك شیری لێ دێت ، لەدەستت دەدەی بەبێ دەسکاری تاوەك سێ تا چوار جار دووبارە هەر رۆژەی ،بەم جۆرە هیشکە بیرۆکەکە نامێنێت و چاك دەبێتەوە .

---

لەگۆڤاری دەنگی پێشمەرگە ژمارە ١٥٠ ئەیلوور ٢٠١٠ بلاوم کردۆتەوە

١٢٦– روورك

روورك کەجۆرە دارێکی سرووشتییەو بەردەوام سەوزە ، جاران لەکوردەواری بۆچارەسەری نەخۆشی شەکرە بەکاریان دەهێنا ، ئامادەکردنی بەم جۆرە بوون

پەلك یاخود ژێرەوەی دار رووركەکە بەگوێرەی پێویست دەهێنن و جوان و پاك دەشۆرێتەوە ، دواتر دەخرێتە ناو مەنجەلێك و هەندێ ئاوی تێ دەکرێت و دەخرێتە سەر ئاگر لەپاش ئەوەی دەکولێت ، دواتر ئاوەکەو دووپارچە شەکری قەند دەخرێتە ناو لەپی نەخۆشەکە و دەبێ دەستی بقوچێنێ تاوەکو بۆماوەی یەك کاتژمێر ، لەپاشان شەکرەکە تام دەکەن ئەگەر شەکرەکە تاڵ بوو کەواتە کاریگەری چارەسەری بووە ، نەخۆشەکە بەرەو چاك بوون دەچێت و پێویستە چەند جارێك دووبارە بکرێتەوە .

---

لە گۆڤاری دەنگی پێشمەرگە ژمارە ١٥١تشرینی یەکەم٢٠١٠ بلاومکردۆتەوە.

## ١٢٧- زەردە سیری

زەردەسیری لەناو دەغل و دان لەدەشت دەڕوێت ، ئەم رووەکە دڕکاویە و دڕکەکەی دەچێت بەدەست و پلدا لەکاتی دروێنەدا ، زەردە سیری لەچارەسەرکردنی ئاگر بەکارهاتووە کە جۆرە نەخۆشیەکە دەبێتە برین ، دڕکی رووەکەکەیان دەهێناو دەیان سوتاند سۆتەکەکەیان لەگەڵ رۆنی خۆماڵی واتە رۆنی کەرە تێکەڵ دەکرد و دەیان شێلا چواردەوری برینەکەیان بەجوانی دەتاشی و سۆتەکەکەیان دەنایە سەر برینەکە ، بەم جۆرە چەند جارێك ئەم دەرمانانەیان ئامادە دەکرد و دەخرایە سەر برینەکە و چاك دەبووەوە .

---

لە گۆڤاری دەنگی پێشمەرگە ژمارە ١٥٢تشرینی دووەم ٢٠١٠ بلاوم کردۆتەوە

## ١٢٨- گوڵە حاجیلە

گوڵە حاجیلە گیایەکە لەوەرزی بەهاران شین دەبێت ، ئەم گیایە گوڵەکەی لەشێوەی نێرگزە ، ئینجا ئەم گوڵە گیایە دەهێنین و بە چەقۆ وردی دەکەی و دەیخەینە ناو قاپێك و هەندێك ئاوی تێدەکەی ، ئینجا دەیخەینە سەرئاگرەکەو ئاوەکەی دەپارزنی ، ئینجا ئاوەکەی لەناو پیاڵەیەك دەکەی ،

ئەوکەسەی تووشی سك ئێشە بێت ئاوەکەی دەخوات بۆ چارەسەری ژانەکەی .

لەگۆڤاری دەنگی پێشمەرگە ژمارە کانوون یەکەم ۲۰۱۰۱۵۳ بلأومکردۆتەوە

۱۲۹- گوڵە هێرۆ

جاران ئەوکەسەی قونێری لەلەشیان بهاتایە ، بۆچارەسەری گوڵەهێرۆیان دەهێناو وردیان دەکرد ، ئینجا شیر تێکەڵی یەکیان دەکردو دەیانخستە سەرئاگر تاوەکو دەکولاً ئینجا پەیت دەبوو لە پاشان لەسەر ئاگرەکە دەیانهێنایە خوارەوە و دوای ساردبوونەوە لەسەر قونێرەکەیان دادەناو بەپارچە قوماشێك دەیان پێچا بەم جۆرە دوو ، سێ جار ، بەهۆیەوە پێستەکەی تەنك دەکرد و نەرم دەبۆوە دەری دەدا ، بەم جۆرە چارەسەر دەبوو

لەگۆڤاری دەنگی پێشمەرگە ژمارە۱۵۵شوبات ۲۰۱۱بلأومکردۆتەوە

۱۳۰- دڕکە زەردە

جاران ئەوکەسەی تووشی نەخۆشی خورشت دەبوون بۆ چارەسەر هەندێك لەدڕکە زەردەیان دەێنا ، کە گیایەکە لەوەرزی بەهاران شین دەبێت و لەوەرزی پایزان وشك دەبێت، لەگەڵ گیایەکی دیکە کەپێی دەگوترێت علك مشکە لەگەڵ دڕکە زەردەکە پێکەوە دەسوتێنن و مشکیەکەی لەگەڵ رۆنی

تەنەکەیان تێکەڵ دەکەن و ئینجا لەشوێنی خورشتەکەی دەدەن وەك دەڵێن بەسوودە .

---

لەگۆڤاری دەنگی پێشمەرگە ژمارە١٥٦ئادار٢٠١١ بلاوم کردۆتەوە

## ١٣١- ڕەشی کەرەکینە

ڕەشی کەرەکینە ، ناوی جۆرەگیایەکی ڕەنگ ڕەشەو لەبەهاران دەردێتەوە هەتا وەرزی هاوینیش خۆی رادەگرێ ، ئەم گیایە شێوەی وەك و سڵقە ، بەلاّم لە پەلکی سڵق بچووکترە ، ئەم گیایە بۆ بەڵەکی باشە واتە بەسوودە ، هەندێك لەم گیایە دەهێنن و وردی دەکەیت و جوان دەیشۆیەوە ، دواتر لەنێو مەنجەڵێك دەخرێتە سەر ئاگر تا جوان دەکوڵێت و دوای ئەوە دەیهێنینە خوارەوە تاوەکو سارد دەبێتەوە، ئینجا چەند ئێوارەیەك بەرلەخەوتن لەو شوێنەی دەدرێت کەبەڵەك بووە ، بەم جۆرە دەبووە چارەسەری

---

لەگۆڤاری دەنگی پێشمەرگە ژمارە ١٥٨ئایار٢٠١١بلاوم کردۆتەوە

## ١٣٢- زەرەند

جاران لەکوردەواریدا بەتایبەت لەگوندەکاندا یەکێك تووشی نەخۆشی شەکرە بوایە ، ئەوەبۆچارەسەری دەچوون هەندێك

زەرەندیان دەهێنا دەیانخستە ناو مەنجەڵێك و هەندێك ئاوی تێدەکرا و مەنجەڵەکە دەخرایەسەر ئاگرێك هەتا تەواو دەکولا، پاشان لەسەر ئاگرەکە دەیانهێنایە خوارەوە دوای کەمێك ساردبوونەوە هەردوو پێی نەخۆشەکە دەخرایە ناو ئاوەکەو هەندێك شەکریش لەناو دەستی نەخۆشەکەیان دادەنێن هەتا شەکرەکە تاڵ دەبێت یان سەوز هەڵدەگەرێت ئەگەر زەرەندیشی لەوکات نەبێت ئەوە دار دولکی بەکار دەهێنرا .

---

لەگۆڤاری دەنگی پێشمەرگە ژمارە ١٥٩ حوزەیران ٢٠١١ بلأوم کردۆتەوە

### ١٣٣- خرە بەند

ئەم گیایە لەوەرزی بەهار دەڕژێتەوەو هاوینان زۆرە ، ئەم خڕە بەنگە توێکڵی هوردی هەیە ، تۆوەکەی لەناو ئاون بکوترێت ، دواتر دۆنی بزن بهێنی ، دۆنەکە لەنێو مەنجەڵێك بخرێتە سەر ئاگر تاوەکو جوان دەقرچێتەوە ، لەپاشاندا ئەو تۆوەی کەوردت کردووە بخرێتە ناو دۆنە قرچاوەکە ، دواتر ئەوکەسەی تووشی نەخۆشی بووەو کرمی هەیە ، دەیهێنی بەنموونە دەستێکی دەستەکەی رادەگری و پارچە قوماشێکی سپی لەسەر دەستی دادەنێی ، دۆنە قرچاوەکەشی لەنزیك دەستەکەی ئینجا ئاو لەدۆنە قرچاوەکە دەکەی تا دوکەڵ بکات و بۆبرینی دەستەکەی بچێت لەهەمان کات شەپێك

لەدەسـتی دەدەی بـەم جـۆرە کرمەکـە لەنێوبرینەکـە دێتـە دەرەوەو برینەکە چاك دەبێتەوە .

لەگۆڤاری دەنگی پێشمەرگە ژمارە ١٦٢ ئەیلوور ٢٠١١ بلأومکردۆتەوە

## ١٣٤- خەنە و خۆڵ

ئـەم دەرمانـە کوردەوارییـە بۆنەخۆشـی هیشـکە بـرۆ بەسـوودە بەزوویی برینەکەی هیشك دەکات ، ئامادەکردنی ئەم دەرمانە تۆزێك خەنـەو هەنـدێ مشـکی دار بـەڕوو لـەدوای سـوتاندنی بەڕووەکە کە دەبێتە مشکی ئینجا دوایی ساردبوونەوە لەگـەڵ خەنەکەی تێکەڵ دەکرێت وەك تۆزێك وایـە لەشـوێنی برینەکە وەردەکرێت و دوای چەند رۆژێك دووبـارە بوونـەوەی برینەکە وشك دەبێت .

لەگۆڤاری دەنگی پێشمەرگە ژمارە ١٧١ حوزەیران ٢٠١٢ بلأوم کردۆتەوە

## ١٣٥- سماق

لەزۆر کۆنەوە لەکوردەوارییدا خواردنی سماقیان بەکارهێناوە بۆنەخۆشی کۆخە ، بەتایبـەت کە کۆخەکە زۆر بوایە هەندێك

سماقیان لەنێو پیاڵەیەك دەکرد و لەو کاتی کۆخەیان دەهات دەیانخواردەوە

١٣٦- خۆر و شیر

هەندێك خۆڵ وردیان دەکرد و بەهێڵەگ وردەکەی دەهاتە خوارەوە و درشتەکەی دەماوە و فڕێیان دەدا ، وردەکەیان دەهێنا و دواتر هەندێك شیر یان دەهێنا و کەمێك گەرممیان دەکرد و ئینجا لەگەڵ خۆڵەکە تێکەڵیان دەکرد و جوان دیانشێلا تاوەکو یەکیان دەگرت ، ئەو کەسەی کەپێی وەردەگەڕا ئەستور دبوو ، دوای تەقاندنی شوێنی وەرگڕانکە بەهۆی دەمارەکە دەهاتەوە جێگای خۆی ، بۆ ئەستوریەکەی ئەو قوڕەیان لەشوێنەکە دەداو بەنایلۆن شوێنەکەیان دەپێچا ، هەروەها هەرشوێنەك لە دەست و پلێ ئەستوربایە وەك دەرمانێك ئەم قوڕەیان لێ دەدای ئەستوریەکەی نەدەما

١٣٧- رەکێشە

رەکێشە گیایەکە لە دۆڵەکان شین دەبی ، ئەوکەسەی مووی یان دەستی بەقریشایە هەندێك لەو گیایەیان دەهێناو دەیانخستەسەر شوێنە برینەکەو بەپارچە قوماشێك دەیان

پێچا و بەهۆیەوە پاك دەبۆوە واتە پیساییەکەی دەردەهات وەك کێم

۱۳۸- رەشکە

ئەوەی دەم وچاوی قینچکەی لێ بهاتایە هەندێك رەشکەیان لەناو ئاون ورد دەکرد و لەگەڵ کەفی سابوون تێکەڵیان دەکرد ، بۆماوەی چەند رۆژەك دەم و چاویان پێی دەشووشت و قینچکە کە نەدەما .

۱۳۹- هەنار

کەیەکێك میزی بگیرایە ئەوە چەند هەنارێکی شیرینیان پێ دەدا بیخوات دەیانگوت لە میزگیرانەکە رزگاری دەبێت

۱٤۰- بنێشتە تاڵ

بنێشتە تاڵ خواردنی بەتاڵی بۆ خاوێن کردنەوەی گەدە باشە هەروەها بنێشتە تاڵ بەکولاوی بۆ ددان ئێشە بەکاریان دەهێنا ، جگە لەمانەش بۆشکان دوای گرتنەوەی شکایەکە بنێشتە تاڵیان دەخستەسەر شوێنەکە و بە پارچە قوماشێك . دەیان بەست . چەند رۆژێك بەم جۆرە شکایەکە چاك دەبۆوە، بۆیە گوتراوە

ئەگەر کەو کەوتە خوار شکا لاق و باڵ
چارەسەری بکە بە بنێشتە تاڵ

١٤١– ناو دەم سوتان

بۆچارەسەری ناو دەم سوتان هەندێك سۆتکە و زاخ و مێخەك و گوڵباخ و شەکر و توێکڵە هەناری شیرین و توێکڵە پرتەقاڵیان دەهێناو لەناو ئاون وردیان دەکرد و بە قەدەر کەوچکە چایەك دەیانخستە سەر برینەکە

١٤٢ -نەخۆشی چاویلکە

ئەوەی پەنجەی دەست و پێی دەبێتە برین دەڵێن چاویلکەیتی بۆچارەسەری چاوی چێڵ یان گۆلك دەهێنن . ئاوەکەی لەگەڵ هەندێك خەن تێکەڵ دەکەن و دواتر دەیکوڵێنن . کە سارد بۆوە لەپەنجەکانیان دەدەن و بە پارچە قوماشێك دەیپێچن و چەند رۆژێك بەم جۆرە بەردەوامدەبن.

١٤٣–خڕنووك و ماست

کەمێك خڕنووك بەسەوزی و لەگەڵ توێژی ماست تێکەڵاو یان دەکرد ، ئەوکەسەی چاوی کول بوایە ، یاخود لەکاتی ژان کردن دەیانخستە سەر چاوەکە.

١٤٤–جاترە

جۆرە گیایەکە وەك کەرەوز وایە و لەدەم کانی و رووبارەکان دەڕوێ . ئەوکەسەی تووشی نەخۆشی ژانە سك بوایە هەندێك لەو گیایەیان دەهێنا و دەیانکوڵاند دواتر ئاوەکەیان دەخواردەوە.

١٤٥– رەیحانە یان نەعنەع

ئەم جۆرە گیایە بۆنەخۆشی گورچیلە و لەناو بردنی کرمی ریخۆڵەکان بەکاریان دەهێنا هەندێك لەم گیایەیان دەهێناو دەیان کوڵاند چەند رۆژێك پێشی نانی بەیانی کوپێکیان لەم ئاوە دەخواردەوە ، هەروەها بۆنی دەمیشی ناهێڵێ

١٤٦– سیسارکە کەچەڵ

سیسارکە کەچەڵ باڵندەیەکە و لەکوردستاندا زۆرە ، جاران ئەوکەسەی نەخۆشی تیراوەی هەبووایە ، ئەم باڵندەیان دەهێناو سەریان دەبڕی ، لەگۆشتەکەی یان لەجگەرەکەی یان سیقەدۆلەکەیان لەکاتی ئێوارە لەسەر برینەکەیان دادەناو بەپارچە قوماشێك دەیان پێچا بەیانی لایان دەبرد ، بەم جۆرە چەند رۆژێك دووبارەیان دەکردەوە

١٤٧– سوڕناتك و رۆنی زەیتوون

ئەم دەرمانە بەکاردێت بۆنەخۆشی هیشکە بیرۆ ئامادەکردنی هەندێك سورناتك دەهێنن کەجۆرە گیایەکی سروشتیە لەناو ئاون وردی دەکەن و لەگەڵ رۆنی زەیتوونەکە تێکەڵی دەکەن و دەیکوڵێنن پاش ساردبوونەوە دەیخەنە سەر شوێنی برینی هیشکە بیرۆکەکە و بەپارچە قوماشێك دەیخەینە سەر بۆماوەی چەند رۆژێك دووبارەی دەکەنەوە و چاك دەبێتەوە.

١٤٨– گەڵای داری بی

بۆ خورشت بەتایبەتی ئەوانەی خورشتی دەستیان ئاوی دەکا یان زیپکە یان هەیە (پەلکەکە) دەسوتێنرێ مشکیەکی پێ دابکرێ یەکاو یەك چاکی دەکاتەوە

١٤٩– کوڵکە خڕنووك

کوڵکە خڕنووك واتە بنی داری خڕنووك پاك بکرێتەوە لەناو ئاو بکوڵێندرێت رەنگی وەی چایە لێ دێت بۆزگ چوون یەکاو یەکە و باشترینە

١٥٠– کەرەوز

کەمێك دەهێنین ووردی دەکەین لەگەڵ ئاو تێکەڵاو دەکرێت دەخرێتە سەرئاگر تا دەکوڵێ پاشان ئاوەکە دەخورێتەوە ئەمەش بەزۆری بۆ زگ ئێشە بەکاردێ

١٥١- خێواوك

بۆ ددان ئێشە باشە ، کەددانیان هێشا لەنێو پیاڵەیەك خێواوك دەکەن و بەدەویان وەدەکەن کەخوێواوەکە ددانەکەی تەڕکرد ژانی نامێنێ.

١٥٢- پونگ

ئەگەریەکێك زمانی کوڵ بوایە واتە قینچکەی لێ دێت ، هەندێك پونگەی دەهێنین، نەخۆشەکە پونگەکە دەجوێ، یاخود پونگەکەی دەکوڵێنن و ئاوەکەی دەخوات

١٥٣- خەزەرۆك

ئەم گیایە دەرمانە بەکاردێت بۆ نەخۆشی گەدە ، ئەم گیایە لەناوچەی شاخاوی هەیە، ئەم گیایە دەهێنن و دەیکوڵێنن کەسارد بۆوە ئەو کاتەی گەدەی هێشا بەپەرداخ دەیخوا.

١٥٣- گۆرمزە

ئەو دەرمانە گیایە دەکوڵێنن و ئاوەکەی دەدەن بەو کەسەی ماری پێوەدابێ .

١٥٤- رەکێشە

ئەم گیایە دەرمانە بەکاردێنن بۆ ئەوکەسانەی تووشی نەخۆشی موو یان بەفرەشینە بووبێت . ئەم گیایە دەخەنە

سەر برینەکەو بە پارچە پەڕۆیەك جوان دەیپێچن . بەهۆیەوە برینەکە خاوێن دەبێتەوە .زۆربەی کات ئێواران ئەو دەرمانەی لێ دەدەن و تابەیانی پاکی دەکاتەوە

١٥٥– گەڵای گەنەگەرچەك

ئەم گەڵایە بۆسەردوومەڵ قونێربەکەڵك دێت هەتا زوو دەربێ

١٥٦– خۆر وەسەرە

خۆر وەسەرە گیایەکە بەکاتی بەهاران هەیەکەلەسۆرکان شین دەبێ پەلکەکەی لەشێوە پەلکی توە بەلاّم زۆر بچووکە ئەم گیایە بۆنەخۆشی ژانە زك باشە ئەم گیایە دکتۆری فۆلکلوری کوردی خۆمان کردیتیانە دەرمان ئەم گیایە دینەوە مالی جوان دەی شۆن لەناو مەنجەلەکی دەکەن دەی کولێنن تا تەواو دەکولێ ئەوجا دەی پارزنن ئاوەکەی لەشێوەی چایە ئەوجا لەجامەکی دەکەن لەبەر شەوبای دادەنێن سەری دادەپۆشن هەموو سبینێك پیارەیەکلەخیرنی دەخۆن بۆخورشت وژانە زك بەکاردیت

١٥٧– مێخەك

مێخەك ئەو گرێیەیە لەبن پێ بەزۆری شین دەبێت یان پەیدا دەبێت جابۆئەوەی بەئاسانی ئەم جۆرە گرێیە نەمێنێ کەزۆر

کـەس بەنەشـتـەر گـەری دەریـی دەهێنـێ لـەکوردەواری زۆر بەئاسانی ئاسەواری نامێنێ ئەویش بەهەڵکۆلێنی ئەم گرێیـە تابەخوێن دێت جاشیری هەنجیر تـی بکە ئـەوا نامێنێت ئـەم جۆرە گرێیە یەکەم جار یەك گرێیە دوای هـی تـریش وەك ئەو لەبنی پێی پەیدا دەبێت لەزۆرشوێنی مرۆڤ پەیدا دەبێت بەلأم بەزۆری لەبنی پێ دێت.

١٥٨– گونەسە

ئەم گونەسەیە گیایەکە بەهاران شین دەبی لەناو گەنم و جۆ هەوەڵ جار دەچی دەی کەی لەبەر هەتاو لەسەر گوشەك یان چاروگەك هەڵی دەخەی هەتاوشك دەبی ئینجا لەناو ئاون دەی کوتی هـەتا تـەواو هـورد دەبـی بـە هێلەگـەکی دادەکـەی دەی بێژی لۆئەوەی باش هوردبی وەکوکل ئەم گیایـە بەقەدەر یـەك بست یان زیاتر هەڵ دەستی بەلأم ئەگەر بە پێمەرە رەگەکەی دەربهێنـێ ئـەوا باشـتر ئـەم دەرمانـە لـەبۆ بـرین زۆر باشـە بەتایبەت برینی مەڕ و بزن و حەیوانی تر لەوکاتەی کەمەرەك گـورگ دەی گـری برینـدار دەبـی ئـەم گونەسـەیەی لێ دەدەن لەبۆماوەکی کـەم چـاك دەبـی زەمـانی زوو بـۆبرینی مـرۆڤیش بەکاردەهات بەلأم ئێستاهەر بۆ حەیوان بەکاری دەهێنن .

١٥٩– غەزەرۆك

ئەم جۆرە گیایە لەبن شاخ شین دەبیّ لەجێی تەڕ ئەم گیایە هیشك دەکەیەوە لەگەڵ هەندێککەرەوز دەیکوتی بەئاون دوایی دەی کوڵێنی بەپەرۆکەکی دەی پارزنی لەناو پەرداخێك ئەکەن هەمووسبینان بۆماوەی چەند رۆژەك بەقەدەر پیالەیەك ئەخۆیئەم جۆرە گیایەش بۆ گەدەش بەکاردیّ

١٦٠– سوڕناتك

ئەم گیایە لەسەرەتای بەهاران وەکو گیایەکانی کوردستان شین دەبێتەوە سوڕناتك گیایەکی پەلك وردە گیایەکە بستێك برندەبی و گوڵێکی زەردی ورد دەگریّ . ئەم گیایە لەقەدەکەی چڕکێك دەردەکا یان بابڵێین تارەبنیشت دەردەکا ئەم چڕکە بۆ ددان بەکەلکە کە ددانی کلۆربیّ یان کون بیّ یان ژان بکا ئەم چرکە بیخەنە ناو بۆماوەی شەوێك تا ژانەکەی دەشکیّ واتە چاك دەبێتەوە

١٦١– دارگەز

دارگەز دارێکی گەلاّ زەردە خەڵکی گەر هیشکە بیۆیان لەشوێنێك هات ئەوا دەچن کەریك یان لقێك لەدارگەز دەبڕن و دەیهاوێنە سەر ئاگر کاتێك گەرم بوو ئاوی لێدیّ پیارەکی دەدەنەبەر تا هەندێك لەو دەرمانەی دەچێتە ناو جالە و شوێنەی دەدەن کە هیشکە بیرۆ یەکەی لیّ هاتیە هەروەها

نەخۆشی هیشکەبیرۆ ئەوەیە کەوا قانێکی خڕ لە شوێنێکی لەشت وشك و سوّر هەڵدەگەرێ و بێزات دەکا چونکە بەدایم دەخورێ وگەربیشی خورێنی خوێنی لێ دێ .

١٦٢- کلێخە

کلێخە جۆرە گیایێکە لەشێوەی پیازە لقێکی درێژی هەیە و لەبن زەویشدا سەلکێکی هەیە سپیە لەشێوەی سەلکی پیاز چۆنیەتی بەکار هێنانی ئەوسەلکە سپیەکەلەشێوەی پیازدایە لەژێر زەوی دەردەهێنی و لەشێوەی بازنەیی قات قات دەیبڕی ئاوێکی لیچی لێدێ . ئەو ئاوە لۆزیپکەی دەموچاو باشە یاخود قینچکەی دەمو چاو ، جا ئەو ئاوەلیچە لەوە زیپکەیە دەدەی تاکو چاك دەبێتەوە

١٦٣- گۆرمەزە

ئەم گیایە دەرمانە بەکاردەهێنین بۆ ئەو کەسەی مار پێوەی دابێ هەندێك لەم گیایە دەهێنن و دەیکوڵێنن و ئاوەکەی دەدەنە ئەوکەسەی مار پێوەی دابێت .

١٦٤- تۆڵەکە

ئارام بەخش و ئەم کەرەوەیە بۆسوتانەوەی سینگ و کۆخە سودی هەیە هەروەها بۆ قەبزی هەمیشەیی بەتایبەتی

لەمندالْ وپیرو ئەوانەی نەخۆشی کۆلۆنیان هەیە سوتانەوەی گەدە و هەلآمەت و تەنگە نەفەسی سودی هەیە هەروەها دەزانی بەخواردنی تۆلەکە دەست دەویْ نرخەکەشی هەرزانە

١٦٥- کاردی

ئەم گیا پەلکەیە تەنها لەگەڕی بەهاردا دەردەکەویْ کەس ناتوانی بەبیْ کولآندن و چاککردنی بیخاتە سەرزمانی چونکە ئازاری زۆرت دەدات ئامادەکردنیشی ئەوەندە ئاسان نیە کابان پێیەوە ماندوو دەبێت بەلآم ژەمێك خواردنی چێشتی کاردی بەتام و بەلەزەتە گەدە و ڕیخۆلەکان لەجۆرەها نەخۆشی پاك دەکاتەوە زۆر جاران باسیان کردوە ئەگەر کرمی ریخۆلەت هەیە بەخواردنی ژەمێك کاردی لیْ ی رزگارت دەبیْ هەرچەندە سوودەکانی کاردی زۆر زانستیانە نەبێت و لێکۆلێنەوەی لەسەر نەکرابیْ بەلآم خواردنی زەرەر و زیانی نیە .

١٦٦- گولە حاجیلە

یەکێك لەگولە خۆرسکەکانی وەرزی بەهارە لەدەشت و دەر هەموو شوێنێك دەڕویْ لەکۆندا بەکاریان هێناوە بۆنەخۆشیەکانی ئازاری سك و پێچ بەسك داهاتن دوای وشك کردنەوە و وردکردنی گولە حاجیلەکە بەتیْ کردنی کەمێك شەکر بەکارهێنانی بۆنەخۆشیەکانی سك بەسوودە

١٦٧- هێلکە

ئەگەر یەکێك بسوتابایە ، ئەوە دەچوون هێلکەکیان دەهێناو دەیانشکاند زەردێنەکەیان بەتەنیا لەناو قاپێك دەکرد و ئەوجا گەرمیان دەکرد پاش ساردبوونەوە دەیانخستە سەر برینەکە و بەپارچە پەرۆیەك جوان دەیان بەستا ، تا چەند جارەك چاك دەبۆوە

١٦٨- پەلکە بەڕوو

پەلکە بەڕوو بۆ پشی سواربونی باشە واتە ڕەبۆدەرمانەکەش ئەو ها دەگێرتەوە

لەسەرەتایی بەهاران بەڕوو وەکو هەموو دارێکی کوردستان دەژێتەوە پەلکی بەڕوو کە تازە دەژێتەوە کە پەلکەکە گەورە دەبێ پەلکەکەڵ دەکەیەوە لەناو مەنجەلەك دەینی جوان دەیشۆییەوە دەیکوڵێنی دووبارە دەی پارزنی سرپاتەکەی دووبارە دەی خەیەناو مەنجەڵ و جوان دەیکوڵێنی تا تیر دەبێ ئەوجا لەبەر شەو بابی دابنێ هەموو سبیانان پیارەك دەخۆی

١٦٩- تووی ڕەش

ئەگەر هاتوو یەکێك دووپشك پێوەبدات ئەوا تووی رەشی لەسەر دادەنێن ژانی دەشکێ

١٧٠- گلێخە بەرازە

گلێخـەش وەکـو گیایـەکانی کوردسـتان سـەرەتای بـەهاران دەژێتـەوە گلێخـەوەکو پیازوایـە پـەلکی سـەوزەپانە سـەلکی هەیـە گلێخـە بـۆ نەخۆشـی کولـك بـەکاردێت دەچـێت هـەری دەقـەنێنی سـەلکەکەی دەینـی جـوان دەی شـۆیەوە سـەرکەکە جوان دەی کوتی و دەیکەیە ئەستوکەك پانی دەکەیەوە ئەوجا لەسەر کولکە دادەنێی و تـا هـەموو کێمەکـەی لێ دێتـە دەرەوە ئەوجا ناوکولکەکە خاوێن دەکاتەوە و چا دەبێتەوە

١٧١- ڕوورك واتە ژاڵە

بۆدەرمانی ئەو جێ یەکی مرۆڤ یان حەیوانات. کرمی بێ ئـەم گیایـە زۆرە لەکوردسـتان بەبـەهارو هـاوین و پـایز و زسـتان هەرپەلکی پێ وەدەمێنێ هیچ حیواناتێك نایخوات و بەس کلۆ نەبێ کلۆ باش دەی خۆن ئەم گیایە پەلکەکەی لێ دەکەیەوە تا هیشك دەبێ ئەجا جوان دەی کوتی و دوایی دەبەیژی ناو ئەو برینەی کەکرمی بووە جوان خاوێنی دەکەیـەوە ئـەم تـۆزە ڕوو دەکەیە نـاو برینەکە ئـەو کرمانـەی کەلـەناو برینـە دەی کـوژی برینەکە چاك دەبێ تەوە

١٧٢- دڕکە زەردەو کلکە ڕێوی

بۆنەخۆشی ئاگرکە باشە

ئەم گیایە لەسەرتای بەهاران دەژێتەوە كلكە ریوی گیایە لەسەرتای بەهاران دەژێتەوە كلكە رێوی گیایەکە و وەکو كلكە رێوی وایە پەلك وردە و درێژە ئەم گیایە بەتەری دەی کەی و تاهیشك دەبێتەوە لەگەڵ درکە زەردە هەردوکی دەسوتێنێ مشكیكەی لەگەڵ ڕۆنی لێك دەدەی ئەوجا لەگەڵ مشكیەكەی لێك دەدەن ئەوجا لەبرینەكەی دەدەن رۆژی سێ جار

١٧٣- دەم كولی

هەندێ مازی دەهێنی لەگەڵهەندێتووی سووری ووشك كراوە لەگەڵ هەندێ گوڵ هەنار لەگەڵهەندێ شملی ئەم پێكهاتانە هەمووی دەبێ ووشك بكرێتەوە ئێنجا دەیكەنە ناو ئاون جوان جوان دەیكوتین تا ووردەبێ و دەبێتە خۆڵەمێش ئێنجا پەنجەت تەڕ دەكەیت و لەدەرمانەكە دەدەیت و دەرمانەكە لە زمانی نەخۆشەكە دەدەیت و لەگەڵ شیفایی خواو ئەم دەرمانە نەخۆشەكە لەدەم كولی رزگاری دەبێت

١٧٤- سەلكە گلێخە

سەلكێك دەهێنین وردی دەكەین و دەیخەینەرۆخی ئاگر تا گەرم دەبێ وینجا دەیخەینە سەر شوێنە بەئازارەكە ئەمەش بەزۆری بۆ نەخۆشی (موو) واتە دەردە پیسەكە بەكاردێت

١٧٥-سماق و هێلكە

ترشـاوەکی جـوان دەگریـەوە واتـە ترشـاوەکی تـیر جـوان لەمەنجەلـەك دەکـەی خـاوێن جوان دەی کـوڵێنی و هێلکەیـەك یـان دوو هێلکـە لـەناو ترشـاوەکە دەکـەی وەکـی کـوللاً ئـەو کەسەی کە زگ چووی لێ یە دەرخـواردی دەکەی وەکو حـەبی فەوری وایە .

١٧٦- مەلحەمی هێلکە

مەلحەمی بەهێلکە ئەم مەلحەمە هێلکە ئارد پێك دێن هێلکەکە دەشکێنی سپیەکەی دەرێـژی بەس زەردێنەکەی لەگەڵ ئارد تێکـەڵی دەکـەی ئینجـا تێکـی دەدەی هەنـدەك خـێ بەسـەردا دەکەی دەبێ خێ کەمی پێ دابکەی ئەگەر بۆبرینی سەربوو خێ زۆر بوو جێگەکەی تووکی لێنایە بۆسەر دوومەڵو قونێر یان برینەك پیس کردبی ئەم مەلحەمەی بۆ لەسەر دادەنێیت.

# سوپاسنامە

بەناوی خۆم و بنەماڵەکەمان زۆر سوپاسی ئەرک و ماندوو بوونی نووسەر جەمال گردەسۆری دەکەم، کە ئەم کتێبەی لەسەر دەرمانخانەکەی فەقێ حسێن-ی باپیرم نووسیووە، بەندەش بە ئەرکی خۆی زانی ئەرکی لە چاپکردنی بگرێتە ئەستۆی خۆی، جێگای شانازییە بنەماڵەکەمان جگە لەم بوارەدا بنەماڵەیەکی شۆڕشگێر بووە و شەهیدی لە پیناو داوە.

**خەسرەو مەنتک**

٢٠١٧/٨/١٣

چاپخانەی رۆژهەلات/هەولێر